# مناجات

ئەسیر وبەند ودیلی نەفسی زالم
بەزەی نایە بەحالم نەفسی زالم

خودایە! رۆژی رەشی چارەڕەشی وشەوی تەنیایی و بێبەشی سەرتاپای تەمەنی دوور و درێژی داگرتووم و رەوڕەوەی بەختەوەری راگرتووم.

وەرە هانای دڵی گڕگرتووم. کە کەسم نیە وبەرجی تۆ فەریادڕەسم نیە.

خودایە! سەرەرۆیی دەورەی خاویم وتاوانی لاویم و نافەرمانی پیاویم بەگەورەیی خۆت ببوورە ، چاوم لە بەرگرین سوورە و هەورازی بە تۆ گەیشتنم لەلا دوورە. وەرە هانام با قەرەبوو کەمەوە هەلی لە دەستچووم و ئاخ هەڵنەکێشم بۆ تەمەنی بابردووم.

خودایە! باری تاوان و هەڵەم ئەوەندە قورس و گرانە شانی چەماندوومەوە. بەم هەموو ئاکارە شوومەوە هاوارم هێناوەتە بەر دەرگات ،ناهومێد وبێ هومێد لە دەرگات شەیتانە و بەس . هومێدم زۆرە چون ئەوەندەی دەفتەری کردەوەم رەش وبۆ رە رەحم وبەزەیی تۆ هەزار بەرامبەری گوناهی منە و چاوپۆشیت دەریایەکی بێ بنە.

خودایە ! بۆ خاتری ئەوانەکەم لە دارەتی دە دنیایە قەتیان بێ ئەمری نەکردووی ،قەتیان ناو لەبیر نەبردووی، بۆ خاتری ئەوانەکەم شەو بەیادی تۆ تا بەیان ناخەون و بێخەون و بەیانی بەناوی تۆ رۆژی نوێ دەست پێدەکەنەوە لە هەموو تاوان و سووچی تاوانباران خۆش بە. دنیا بۆ هەموو لایەک پڕ لە خێر و خۆشی و بەرەکەت بکە ! هەموان لە بەڵای زالم و شەڕی شەیتان بەدوور بکە. هەموان بەرەو سەلاح و خێر و چاکە رێنوێنی بکە منی هەژار و بێ هانا و چارەڕەش و بێ بەشیش لە پەنای ئەوان !

ئامین یارب العالمین

به ناوی خودا

## سەروتار

سلاو لەخوێنەرانی بەرێز

گوتمان کە رەخسانی دەرفەتی بەوەج بۆ ژیانی خاوێن وبەشەرەف تەنیا بە خەباتی راستەوخۆ دژی زولم و دامودەزگای سەرەرۆی چەوسێنەران مەیسەر* دەبێ.

بەخۆت نیە ، ئەگەر بتەوێ رزگار وسەربەخۆ و بێ دەربەستی بژی وبەکورتی ئینسان بی وتەنیا پاڵ وەسرشت وخولقانی ئازادی خۆت بدەی لەگەڵ زولم و حاکمەتی زولم وچەوساندنەوە تێک هەڵدەچی، کە لە وتارەکانی پێشوودا بەوردی لەسەری دواوین بەلام ئەوی گرینگ شێوەی خەباتە کە دەبێ چۆن خەبات بکەین .

" روونە کە خەبات دژی چەوسێنەرانی جیهانی بەسەرکردایەتی ئامریکا کردەوەی دەوێ وگاڵتە نیە. هەروەک بەداخەوە لەئێرانی دەوری تاغووت وحوکمەتە سەرسپێراوەکانی ئێستای ناوچە ««چەوسێنەری» وەها

تان وپۆی ئابووری وسنعەتی
و سیاسی وفەرهەنگی وکۆمە
لایەتی یان تان و پۆی
چەوسێنەری وەها ئابووری و
سیاسەت وفەرهەنگ و باری
کۆمەلایەتی تەنیون کە
بەراستی وەلابردن وچاوپۆشی
لە سەرسپێراوی ئەوان زۆر
ئەستەمە وسانی نیە"

ئەنگوست لەسەر روالەت
دانانی ئەم خەباتە چ بە
قسە وچ بەنووسین خۆفریو
دانی نەزانانە و کەم
برستی مندالانەیە و هیچی
دی !

بناخە، مەرجی سەرکەوتنی
هەر شەڕ و خەباتێکە.
بناخەیەک کە بتوانێ هانەی
پێویست بۆخەباتی درێژخایەن
و بە تاووتین لە ورەی
گەلدا پێک بێنی و روحی
بەرگری و خۆراگری وئیمان
بە نەفس وبە سەرکەوتنی
یەکجاری لەدڵ باوێ. لە
پێوەندی لەگەڵ بناخەدا لە
سایەی حەمدی خوداوە هێز و
ورەیەکی زۆر دەبیندرێ کە
وەبیرهێنانەوەی هێندیکان
لێرەدا بەپێویست دەزانین.

**١- دژایەتی زاتی :**

وەک پێشان گوتمان
باسی نێوان ئێمەوچەوسێنەر
بەهۆی زێدەویستی وانیەکە
بتوانین بڵێین لە جێیەک
دەستەودەیارەی چەوسێنەران
وگەلانی رزگار و سەربەخۆ
یەک دەگرنەوە. هەرکات
ئەم مەبەستەش پێک بۆ
قەت چەوسێنەر دانی پێدا
نایەنێ.

جائەگەر قەرارە بژین
و سەرەتایی ترین مافی
ئینسانیمان ببێ دەبێ
لەگەڵ کفر وشیرک وزولم
خەبات بکەین.

**● بائەوەش روون بکەینەوە کەقسەمان لەگەڵ خۆفرۆشان وسەرسپێراوانی بێگانەو ئەوانە کەروحی تەسلیم وسووکایەتی وژێرچەپۆکەیی لە دڵ خەڵک داوێن نیە.چون ئەوانەبۆخۆیان کایەی دەستی، کولەدارن وملۆزمی رێگەی گەلانن و بوونە ئاوبەندی رێبازی ئەوان. جا ئەم ئاوبەندەش دەبێ لەسەر رێ هەڵگیرێ ●**

**با ئەوەش روون بکەینەوە
کە قسەمان لەگەڵ خۆفرۆشان
و سەرسپێراوانی بێگانە و
ئەوانە کە روحی تەسلیم و
سووکایەتی وژێرچەپۆکەیی لە
دڵی خەڵک داوێن نیە.چون
ئەوانە بۆخۆیان کایەی
دەستی کولەدارن وملۆزمی
رێگەی گەلانن و بوونە
ئاوبەندی رێبازی ئەوان.
جا ئەم ئاوبەندەش دەبێ
لەسەر رێ هەڵگیرێ.**

بەکوردی هەستی رزگار-
یخوازی وسەربەستی و رێز
بۆ مافی تاک وگەل دانان
لەگەڵ بیروبڕوای دڕندانە
و ملهوڕانەی چەوسێنەران
یەک ناگرێتەوە و یەک
بوونی ئەم دووە مەحالە و
بەربەرەکانی ودژایەتیان
بەردەوام درێژەی هەیە.

" ئەگەر سپی پۆشانی
ئازادە خۆیان بۆ خەباتی
چارەنووس ساز تەیار نەکەن
دەبێ چاوەڕوانی دەستەلاتداری
رۆژ لە رۆژ پتری بەڵەک
پۆشان وتاریکان پەرستان
بن و فەوتانی گەلی
خۆیان بە چاوی خۆیان
ببینن "

جا ئەوە دەتوانێ بۆ
خۆی بناخەی قایم و پتەو
و هانەی گەل بۆ بۆخەبات
دژی ویست وقازانجی،
نابەجێی کولەدار و
چەوسێنەران.

**بایەخی گەل ونەتەوە :**

بێ شک هەر نەتەوەیەک
بەزمان ورەنگ و رەگەزی
تایبەتی خۆیەوە لە چوار
چێوەیەکی دیاری کراوی جیهان
دەژین وخوویان بەبەشێک
لە گۆشی زەوی گرتووە و
بەدرێژایی ژیانی پرهەڵس
وکەوتیان فەرهەنگیان لەگەڵ
باری جوغرافیایی ونژادی و
...رێک کەوتووە و ئەم
مەبەستە بۆتە هۆی ئەوە

تا هێندێک لەباری هەست و روحەوە دڵبەندی پێ پەیدا بکا وبەم پێیە بە زۆر شت دڵبەند دەبێ و لە زۆر شت دڵمەند دەبێ.
ئەم بەرزینەهەستد بەراستی چەشنە هەڵوێست گرتنێکە و دەتوانێ لەزۆر دەرفەتدا هانەی بەربەرەکانێ لەگەڵ هێرش گەلێک بێ کەبەمەبەستی فەوتاندنی فەرهەنگ و دڵبەندی گەلی ونەتەوەیی و رەگەزی گەلانی جۆربەجۆر دەکرێ.

ئیمڕۆ چەوسێنەری، جیهانی وێڕای ئەو جووڵانەوە رواڵەت هەڵخە- ڵەتێنە وچاوڕاوە درۆ بۆ بناخەیە کە بەقسەی خۆی پارێزگاری لە مافی گەلان دەکا بەڵام‌بەپێچەوانە تەنیا لە موعادەلەی سیاسیدا گەلێک لە مافی نەتەوەکان وەردەگرێ، حەول دەدا خەڵک لە فەرهەنگی ریشەدار و رەسەنی خۆی دەست هەڵبگرێ وفەرهەنگی خۆ دوڕاندن و کشانەوە وەربگرێ.

بەم شێوەیە پارێزگاری لە هەموو فەرهەنگ و داب و رەسم و نەریتی گەلی و نەتەوەیی و دڵبەندی بە ئاوو گڵ و نیشتمان لەجێی خۆی هانەیەکی بەوەج و بەرچاوە کە گەل لە بەرامبەر شەپۆلی هەراوی تەیار دەکا و لێبراویان دەکا خۆراگر بن. ئەم خۆ راگری یە شەرێکی بەربڵاوو هەمەلایەنەی بەدواوە

## بنام خدا

# سرمقاله

با سلام به‌خوانندگان محترم

گفتیم که دستیابی به شرایط مناسب برای حیاتی طیبه و شرافتمندانه راهی جز مقابله‌ای جدی با اساس ظلم ودستگاه خودکامه استکبار ندارد. این مبارزه امری اختیاری نیست و چنانچه بخواهیم آزاد، مستقل خودکفا و خلاصه انسان بمانیم و بر آزادگی خود در خلقت تکیه و تاکید داشته باشیم، لاجرم با عاملین جور و حاکمیت ظلمت و استثمار درگیری جدی خواهیم داشت و این مطلبی است که در بحث گذشته تاحدودی تعیین گردیده است.

نکته مهمی که‌مطرح میشود اینست که این مبارزه چگونه صورت میگیرد؟

"روشن است که مبارزه با استکبار جهانی بسرکرد- گی آمریکا درعین عملی بودن بهیچ وجه شوخی بردار نیست، چه با نهایت تاسف در زمان حاکمیت طاغوت درایران وحکومتهای وابسته فعلی منطقه تسلط عینی وذهنی استکبار در تاروپود بافت اقتصادی، صنعتی واز آنها مهمتر اجتماعی، سیاسی وفرهنگی ملتهای تحت ستم بگونه‌ای جا باز کرده است که بطور حتم نمیتوان حذف پارامترهای وابستگی را امری ساده وآسان تلقی کرد.

تکیه بر ظواهر امر و محدودیت دراین مقابله در نوشتار و گفتار نیز جز ساده‌اندیشی کودکانه وخود فریبی جاهلانه چیز دیگری نخواهد بود، هر مبارزه و جنگ پیروزی، نخست نیازمند مبنا است مبنایی که قادر باشد انگیزه‌های لازم را برای یک مبارزه دراز مدت وداغ در آحاد یک ملت ایجاد وروح سلحشوری و استقامت واعتماد بنفس وایمان به‌پیروزی نهائی را درآنان بدمد. در رابطه با مبنا بحمدا... قوت و استواری بسیار دیده میشود که‌برخی از ابعاد آنرا یادآور میشویم.

### ۱- تزاحم ذاتی

چنانکه پیشتر یادآور شدیم بحث ما بااستکبار ( بدلیل زیاده‌طلبیش )

بگونه‌ای نیست که بتوان تزاحم ذاتی دارد وجمع این مرحله‌ای را که در آن دومحال وتقابل وستیزشان عوامل استکبار و ملتهای اجتناب ناپذیر است.

**" البته روشن است که خودفروختگان و وابستگان به اجانب و آنانکه آگاهانه روح تسلیم و ذلت را در مردم میدمند موردنظر و خطاب نیستند چه اینان خود به‌عنوان ملعبه‌های استعمار از آنجا که سدراه ملتها هستند باید از سدراه برداشته شوند."**

آزاد ومستقل باشند، متصور شد. و چنانچه این تصور بوجود آید هرگز مورد تصدیق او واقع نخواهد شد...

بنابراین اگر قرار است زنده واز حداقل حقوق انسانی بهره‌مند باشیم هیچ راهی جز مصاف با قوای کفر وشرک و ستم نخواهیم داشت.

**"البته روشن است که خودفروختگان و وابستگان به اجانب و آنانکه آگاهانه روح تسلیم و ذلت را درمردم میدمند مورد نظر و خطاب نیستند چه اینان خود به عنوان ملعبه‌های استعمار ازآنجا که سد راه ملتها هستند باید از سرراه برداشته شوند."**

بطورخلاصه روح استقلال طلبی و آزادگی و احترام به حقوق فردی و اجتماعی انسانها باتفکر ددمنشانه و قلدرانه مستکبرین

**"اگر سفیدپوشان آزاده خود را برای نبردی سرنوشت ساز وجدی مهیا نسازند باید در انتظار تسلط روزافزون سیاهپوشان وظلمت پرستان و نابودی مردم خود باشند"** واین خود میتواند مبنایی استوار و انگیزه‌ای قوی برای تهاجم به منافع نامشروع استعمار واستکبار باشد.

**۲- ارزشهای قومی وملی**

بی شک هر ملتی با هر زبان ورنگ ونژادی که دارد در محدوده معینی ازجهان می زید وبابخشی ازاین کره خاکی انس گرفته ودر طول زندگی پر فراز ونشیبش فرهنگی متناسب با مختصات جغرافیایی، نژادی و.... پیدا کرده، همین امر موجب میگردد تا برخی وابستگی های روحی وعاطفی در وی پدیدار گشته وبر آن اساس به برخی

مسائل دل بسته وازبرخی دیگر احساس تنفر کند. این احساس ولاء یا برائت که درحقیقت خود نوعی موضع‌گیری است نیز میتواند دربعضی ازشرائط انگیزه مقابله با تهاجماتی شود که به قصدنابودی فرهنگ ووابستگیهای قومی ونژادی ملتهای مختلف تدارک میبابند

امروزه استکبار جهانی در کنار حرکتهای ظاهر فریب وتبلیغات بی اساس وکاذب خود مبنیی بر دفاع ازحقوق ملتها که صرفا " جهت واروساختن هدفدار اقوام درمعادلات سیاسی وبهره‌برداری ازآنها صورت میگیرد، سعی مینماید تا با تهی ساختن مردم از فرهنگ ریشه‌دارواصلیشان زمینه‌های پذیرش فرهنگ خودباختگی وانفعال را در آنها ایجاد نماید.

**"بدین ترتیب دفاع از مجموعه فرهنگ، آداب، سنن و مرسومات قومی و ملی علاقه به‌آب وخاک ومیهن نیز بنوبه خود انگیزه قابل توجهی است که مردم را در برابر موج فزاینده حضور توسعه طلبانه قدرتهای جهانی به‌مقابله استقامت وجنگی تمام‌عیار بکشانند."**

ادامه دارد

## مامۆستا محەممەد ساحێب یوسفی


" ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە "

خودای مەزن فەرموویەتی : **ولتکن منکم امة یدعون الی الخیر و یأمرون بالمعروف و ینهون عن المنکر و اولئک هم المفلحون .**

واتە : پێویستە دەستەیەک لە ئێوە هەبێ تا خەڵک بۆ لای ئیسلاح و چاکە بانگ بکەن. ئەمر بە چاکە بکەن و مەنع لە خراپە ، و ئەو دەستەیە بە راستی رزگاروخۆشبەختن. ئایاتی پیرۆز لە بارەی ئەمر بە چاکەو نەهی لە خراپە زۆرن، وەکوو : ئایەی ١١٣ و ١١٤ لە سورەی آل عمران، ئایەی ٧١ لە سمورەی تۆبە ، ئایەی ٢ و ٧٨ و ٧٩ لە سورەی مائدە ، ئایەی ٤١ لە سورەی حج ، ئایەی ١،١٤ سمورەی نساء ، ئایەی ٩ سورەی حُجُرات .

هیوادارین خۆتان ئەو ئایەتانە بخوێننەوە و پەندیان لێوەر بگرن .

ئەمر بە واجب و نەهی لە حەرام لە سەر هەموو کەس واجبە ، ئەگەر کەسێک ببێ هەر ئەو بیزانێ،یان هەر ئەو دەستەڵاتی ببێ فەرزی عەینە لە سەری ، ئەگینا فەرزی کیفایەیە ، و ئەگەر کەسێک بیکا لە سەر باقی لادەچێ ،وئەگەرکەس نەیکا هەموویان گوناهبار دەبن .

حەزرەتی رەسوول ( د خ )فەرموویەتی : ئەگەر کەسێک لە ئێوە بێ شەرعێکی دیت دەبێ مانیعی بێ بە دەست، ئەگەر دەستەڵاتی نەبوو بە زمان و ئەگەر هەر نەبێ بە دڵ بی بوغزێنێ و پێی ناخۆش بێ ، ئەوەش کە هەر بە دڵ پێی خراپە ئیمانی زەعیفە ،کەسێک ئیمانی بە قەوەت بێ سەر دانا خا و حەق و ناحەق دەڵێ ، لە حەدیسی شەریفدا دەفەرموێ : **افضل الجهاد کلمة حق عند**

**سلطان جائر.** واتە گەورەترین خەبات و فیداکاری گوتنی قسەی راست ودروستە لە لای حاکم و فەرمانڕەوای زاڵم وستەمکار. لە حەدیسێکی دیکەدا دەفەرموێ: تەواوی کاری چاک و خەبات لە رێگەی خودا لە بەرانبەر ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە وەک دڵۆپێکە لە حاست بەحرێک.

ئەبوو عوبەید بنی جەراح دەڵێ عەرزی حەزرەتی رەسوولم کرد کام شەهید لە لای خودا مەقام و پایەی بڵیندترە، لە جوابدا فەرمووی: **رجل قام الی وال جائر فامره بالمعروف و نها عن المنكر فقتله فان لم يقتله فان القلم لايجري عليه بعد ذالک و ان عاش ماعاش.**

واتە: پیاوێک کە بەرهەڵستبکا لە رووی فەرمانڕەوایەکی ستەمکار دەستووری بداتێ بە چاکە و پێشگیری لێ بکا لە خراپە ئەویش بیکوژێ، و ئەگەر نەیکوشت تازە قەڵەمی مەلائیکەی خێروشەر لە حاستی ئەو هیچ نانووسێ هەر چەند بژی و بمێنێ.

ئاگادار کردنەوەی فەرمانڕەوایان بۆلای عەداڵەت و دادگەری سەوابی زۆرە کە لەو وتارە کورتەدا بەیان ناکرێ.

"حسن بصری" دەڵێ حەزرەتی موحەممەد (د ـ خ) فەرموویەتی: **افضل شهداء امتی رجل قام الی امام جائر فامره بالمعروف و نهاه عن المنكر فقتله علی ذالک، فذالک الشهید منزلته فی الجنة بین حمزه وجعفر.**

واتە: گەورەترین شەهیدانی ئۆمەتی من پیاوێکە بەرهەڵستبکا لە رووی پێشەوای زاڵم و ستەمکار، دەستووری بداتێ بە چاکە مەنعی بکا لە خراپە، جا ئەویش لە سەر ئەو فەرمانە بیکوژێ، مەقام و پایەی ئەو شەهیدە لە بەهەشتێدا لە بەینی "حەمزە" و "جەعفەر".

"عمر بن خطاب" خوای لێ رازی بێ دەفەرموێ لە پێغەمبەری خوام بیست کە فەرمووی: **بئس القوم قوم لایأمرون بالقسط و بئس القوم قوم لا یأمرون بالمعروف و لاینهون عن المنكر.**

واتە: چە خراپ قەوم و هۆزێکن ئەو گەلە کە دەستوور بە عەداڵەت نادەن، و چە خراپ گەلێکن ئەو قەوم و هۆزە کە ئەمر بە مەعروف و نەهی لە خراپە ناکەن.

لە رۆژی قیامەتدا پیاو خۆی هەڵدا وەسێ بە پیاوێکی دیکەوە، ئەویش نایناسێ لێی دەپرسێ بۆ وادەکەی خۆ من و تۆ یەکترمان نەدیوە و نەناسیوە، جواب دەداتەوە و دەڵێ تۆ منت لە سەر گونادی و مەنعت نەکردم.

بە کورتی ئەمر بە چاکە و مەنعی خراپە هۆی خۆشبەختی وڵات و میللەتە، بناغەی ئەمن و ئاساییشە، خوو ورەویشی خراپ بەوئەمرە پاک دەبێتەوە و سیفاتی باش جێگەی دەگرێ. بە تایبەت لەو زەمانەدا کە ئەمانەت و راستی، حەیا و پیاوەتی کەم بووە، زوڵم و زۆری، فیتنە و خەیانەت، فێڵ کردن و کەم پێوان، بۆ ئیحترامی بە زانایانی بەرزی دینی بەو کارە گرینگە پێویستی زۆرە.

خودای تەبارەک و تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا گەورەیی ئۆمەتی حەزرەتی محەممەدی بە سەر ئۆمەتەکانی دیکەدا سەبارەت بە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بەیان کردوە:

**کنتم خیر امه اخرجت للناس تامرون بالمعروف و تنهون عن المنكر.**

**(ئایەی ١١٠ سوورەی آل‌عمران)**

واتە: چاکترین ئۆمەتێکن کە لە نێو خەڵک دا ئاشکرا بوونە، چون ئەمر دەکەن بە چاکە و مەنع دەکەن لە خراپە جا ئەگەر موسڵمانان ئەو دوو سفەتەیان نەبێ چاکەکەیان لە کوێدا؟

بەراستی موسڵمانان لە زەمانی پێشوودا شایانی مەدح و تاریف بوون لە بەر ئەوەکە

عەمەلیان بە قورئان و بە سونەت و یاسای بەرزی ئیسلام بووە، بۆ وێنە دەگێڕنەوە کە حەزرەتی ئەبووبەکر (رضی..) لە زەمانی خەلافەتیدا ئیمامی عومەری کردە قازی مەدینە و لە ماوەی سالێک کە لەو مەقامەدا ماوە کەسێک بۆ ئیش و کارێک نەچوو لای، ناچار بوو ئیستیعفای دا، حەزرەتی ئەبووبەکر (رضی) هۆی ئیستیعفا و نەچوونی خەڵک بۆ لای پرسی. ئەویش فەرمووی یا ئەبابەکر: قەومێک رێز لە گەورە بگرێ و گەورەش لە گەڵ چکۆلە بە رەحم و شەفەقەت رەفتار بکا، ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بکا، ئینسافیان هەبێ و حەقی دوژمن لە نەفسی خۆیان بستێنن، بە دەسەڵات لە نێویاندا زەعیف بێ تا حەقی لێ بستێنرێ و زەعیف و بێ دەسەڵات لە نێویاندا بە دەسەڵات بێ تا حەقی بۆ وەردەگیرێ، ئەگەر کەسێک نەخۆش کەوت عەیادەتی لێ بکەن و ئەگەر مرد لە گەڵی بچنە سەر قەبران و قانوونی ئیسلام بە جێ بێنن. ئەو قەومە نیازیان بە حوکمی عومەری خەتاب نییە.

جا کە وا بوو موسڵمان دەبێ لە خودا بترسێ، بۆ عیززەت و سەعادەت تێبکۆشێ، بۆ بە دوور بوون لە بەلا، بۆ رزگار بوون لە زوڵمی زاڵمان و خوێن رشتن و خوێن رژان و هەر وەها رو بە روو نەبوون لە گەڵ گرانی و قاتی و کەم بارانی.

عەبدوڵڵا کوڕی عومەر خودای لێ رازی بێ دەڵێ حەزرەتی رەسوول (د خ) رووی تێکردین و فەرمووی: ئەی جەماعەتی موهاجرین، پێنج خەسڵەت و سفەت هەن ئەگەر تووشی وان بن لە هیلاکەت نیزیکە:

١- بڵاو بوونەوەی زنا و فەحشا لە نێو خەڵک دەبێتە هۆی بڵاو بوونەوەی تاعوون و دەردی گران.

٢- کەم فرۆشی و سووک پێوان دەبێتە هۆی گرانی و قات و قڕی و سەخت بەڕێچوون و زۆر بوونی زوڵمی کاربەدەستان.

٣- نەدانی زەکات دەبێتە هۆی وشک ساڵی و کەم بارانی.

٤- شکاندنی عەهد و پەیمان لە گەڵ خودا و رەسوول و ئۆمەتی دەبێتە هۆی زاڵ بوونی دوژمنێک لە غەیری خۆیان بە سەر ئەواندا.

٥ - ئەگەر پێشەوا و کاربەدەستیان بە فەرمان و کتێبی خودا عەمەل نەکەن خودای گەورە شەڕ و نزاعیان دەخاتە بەینی وهەر بۆ خۆیان یەکتر زەبوون و بێدەسەڵات و هیلاک دەکەن.

دیسان لازمە بڵێین کە لە تەرکی نەسیحەت و تەرکی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە بەلایەکی دیکەش پەیدا دەبێ و ئەو بەلایەش ئەوەیە کە دوعا لەو قەومە قبووڵ ناکرێ.

هەر وەها پێویستە لە سەر ئەوکەسەش کە ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکا بۆ خۆی لە پێشدا عەمەلی پێ بکا، چوون قەول و گوتنی بێ عەمەل کاریگەر نیسە. بۆیەش خودای تەبارەک و تەعالا دەفەرموێ:

**یا ایها الذین آمنوا لم تقولون ما لا تفعلون کبر مقتا " عندالله ان تقولوا مالا تفعلون .**

واتە: ای ئیمانداران بۆ دەڵێن ئەو شتەی کە عەمەلیان پێناکەن، ڕق و غەزەبی خودا زۆرە لە حاستی ئەوانەی کە دەڵێن و عەمەل ناکەن. ئەوە بوو کورتەیەک لە بارەی ئەمر بە چاکە و نەهی لە خراپە وئەو کارە گرینگەش واجبی سەرشانی هەموو برایانی موسڵمانە بە تایبەت مامۆستاکانی ئائین و ئیمام جومعەکانی بەرێز.

داوا دەکەین لە خودای عظیم الشأن تۆفیق مان بدا لە سەر قەول و فێعلی چاک و لە سەر گوتن و بیستنی قسەی حەق و لە غەزەب و عەزابی خۆی بمانپارێزێ - ئامین.

# ئەدەبی فەلەستین

رەحیم لوقمانی

ساڵی (١٩٤٨)کە ئیسرائیل فەلەستینی داگیر کرد گۆڕانێکی بنەڕەتی لە کۆمەڵگای فەلەستیندا پێک هات .زۆربەی خەڵکی شارەکان بەرەوولاتانی دیکەکۆچیان کرد ئەوەی مابوونەوەخەڵکی گوندەکان بوون کە دوژمن تەنگی پێ هەڵچنین ودەرەتانی هەرچەشنە بزووتنەوەیەکی سیاسی و ئەدەبی لێ بڕین .پاش ئەم کارەساتەئەدەبیاتیش لەهەموو بارێکەوە گۆڕانی بەسەردا هات .

نووسەروشاعیری ولاتانی میسرولوبنان وسووریەکەلەو دەمەدا پێشەنگی گۆڕانی تازەوشۆڕش بوون تەئسیریان کردەسەرئەدەبیاتی فەلەستین بەم جۆرە رووناکبیران لە دەرەوەی وڵات بناغەی ئەدەبێکی تازەیان بەناوی ئەدەبی ئاوارەکان یان ئەدەبی غوربەت داڕشت .

هەرلەودەمەیداکەتاریکی وبێ دەنگی باڵی کێشابووە سەرئەدەبی فەلەستین، شیعر وەک هەورەتریشقە بروسکەی ئەستاند وشەقڵی شکاند . شیعری فەلەستین لەژێر تەئسیری ئەدەبیاتی عەرەب وئورووپادا قالبی کۆن و سوننەتی باوی خۆی شکاندو کەوتەسەرشێوەورێبازی تازە. ئەم شێوەتازەلەگەڵ غەمی لە دەست چوونی فەلەستین ئامێتەببوو* . باوەریان بە رووداوە دڵتەزێنەکەبوو. شکەستیان قەبووڵ نەدەکرد و هەرلەبیری گەرانەوەدابوون .

بەڵام ئەوەی مابوونەوە ئەوگوندی یانەبوون کە دەسەڵاتی داگیرکەران بە تەواوی بەسەریانداتەنەوەی کردبوو .دوژمن دیواری سیاسی وفەرهەنگی خۆی بەدەوریاندا هەڵچنیبوو. خەڵک لەبارێکی تاریک وتەنگەبەردا دەژیان هیچ پێوەندیان لەگەڵ دەرەوەنەبوو دەرەتانێکی وانەبووشاعیرونووسەریان تێدا پەروەردەببێ .دەرەتانی هەرچەشنەشوێنەوار وکاری ئەدەبی یان لێ گیرابوو دەزگای چاپ وبلاوکردنەوە بۆ خەڵک نەبوو... داگیرکەر هەمووشتێکی خۆی بە زۆری دادەسەپاند .

لەمبارو دۆخەتاریکەدابوو کە شیعر دەیتوانی لەهاندان وبەرگریدا بەبڕشت وکاریگەر بێ وپێوەندی مەعنەوی لە نێوان کۆمەڵدا پێک بێنێ . لە پێشدا شیعرەکان شێوەی کۆنیان تێدا ڕەچاودەکرا ، کەبەهاسانی لەبەردەکران و هەستی خەڵکیشی یان چاکتر دەبزاوت .هەرئەمەش هۆی سەرەکی بووبۆوەی شاعیری عەرەب تەکتیکی شیعری کلاسیک ڕەچاوبکەن .بەڵام لەپەنای ئەمەشدا شیعری تازە ونەمر سەری هەڵداو پەرەی ئەستاند کە بناغەی قەڵایەکی سەخت و پۆڵاینی لەخەبات وهاندان داڕشت .

شیعری میللی زمانی ئاوات وئارەزووی خەڵک بووشاعیران لەهەموکۆڕوشوێنێکدا ،گوللەی وشەیان بەلوولەی تفەنگی داگیرکەرانەوە .دەنا هەر بۆیەش زۆربەیان کەوتنە زیندان، یان ئیعدامکران.

هەرئەموەزعەناڵبارەبووکە شاعیرانی پایەبەرزومقاومی

وەک ،مەحموود دەروێش
سەمیحەلقاسم- سالمجەبران
توفیق زیادو....پەروەردەکرد
کەلەمەیدانی خەبات و،
بەرگریدا وەک نموونەی بێوێنە
دەدرەوشێنەوە .ئەمشاعیرانە
سەرەرای ئەوشاریزۆرولێدان
وزیندان ودوورخستنەوە ،لە
بەرانبەر داگیرکەرڕا وەستا
وگەل ونشتیمانی خۆیان
بەجێ نەهێشت .

شیعری نەتەوەیی یا
فۆلکلۆری حەماسی لە
ماوەی(٢٠) ساڵدا دەورێکی
گرینگی لەژیانی خەڵکدا هەبوو
ئەمشیعرانە زۆرترلەزاری ئەو
کەسانەوەدەهاتەدەرکە لە
ئۆردوگای ئیجباری دابوون
کەم کەسی فەلەستینی هەن
ئەمشیعرە میللی وپڕسۆزەیان
نەبیستبێ کە شۆڕشگێرێک لە
ساڵی١٩٣٦ چەن سەعات پێش
ئێعدامکردنی لەزیندان
کوتوویەتی .

زیندانی یەکان ئەم
شیعرەیان لەدیواری زیندانەکە
نووسی یەوەکەپاشان وەک
سروودی میللی فەلەستین
دەنگی داوە .

ئاخرین شەو :
ئەی شەومەڕۆ !
مەودا بدەبەئەسیرێ
با تەواوی کەسۆزەکەی،
هێدی بڕۆ
چون بەیانی بەشنەی با
رادەهەژێ بەدارەوە .

*　　*　　*

ئەی شەومەڕۆ!
دەمەوبەیان
گڕی ئەوینی ئەمدیلە دەکوژێتەوە
بالای بەندی وەک پیرەدار
بەدەستی خوێریێ ونا پاکان دەشکێتەوە

*　　*　　*

ئەی شەوتۆزێ هێدی بڕۆ
تا هەڵرێژم گشت حەسرەت وخەمەکانم
رەنگە لەیادت نەمابێ
کەمن کێ بووم؟
هیوام چ بوو؟
چما لەبیرت نەماوە
پەژارەومەینەت وژانم ؟
داخم ئەی شەو
لەگەڵ تۆدا دەبڕێتەوە
دوایین هەناسەی ژیانم !

*　　*

وا مەزانە فرمێسکی من لەترسانە !
گریانم بۆنیشتمانە !
بۆکۆشێ منداڵەبرسی یە
کەچاوەڕێن لەماڵەوە
پاش من کێ بێ نان ئاوەریان؟
بۆدووبرای گەنجم دەگریم
کەبەرلەمن
وێکرا دران لەسێدارە

*　　*　　*

سۆزی ژیان
چۆن رادەبرێ لەهاوسەرم
کەسەرو ئاخی بۆمنەوزارۆکانم

پاشنەمانم.
ئەوکاتەی شەڕ بانگی کردم
گوارە وخرخاڵم نەهێشتن
چونکە داوای چەکی دەکرد
نیشتمانم

* * *

ئەگەربژیوم نەمێنێ
ئەگەرنوێن وجل وبەرگەکەم بفرۆشم
ئەگەر ببم بەسەنگتراش
یان بارەبەر
یان گسک دەر
ئەگەر ببمە خزمەتکاری کارخانەکان
ئەگەر بۆدانەوێڵەیەک سەرانگوێلکان وەرددەمەوە
ئەگەر لەبەر رووتی وبرسێتی نەتوانم دەنگ هەڵبڕم
بەلام ئەی دوژمنی هەتاو!
لە گەڵ تۆدا پێک نایەم من
هەتا دوایین ترپەی دڵم
خۆرادەگرم

* * *

ئەگەردوابستی خاکیشم داگیر بکەی
ئەگەر جوانیم بکەیتەپێخۆری زیندان
ئەگەر میراتی باوکانم
کەل وپەل ودەفروکووپەم،
داگیربکەی بیفەوتێنی
ئەگەر شیعروکتێبەکانم
لێ بکەیتەدەستە چیلە، بیسووتێنی
ئەگەر گۆشتم باوێیتەبەرسەگی برسی
ئەگەر وەک مۆتەکەی بەسام
لەسەرسینگی گوندەکەمان
چۆک دابدەی بۆ مەترسی
بەلام ئەی دوژمنی هەتاو!
لەگەڵ تۆدا پێک نایەم من
هەتا دوایین ترپەی دڵم
خۆرادەگرم.

* * *

ئەگەر گڕی شەوی تاریم دابمرێنی
ئەگەر لەماچێکی دایکم بێ بەری بم
یان منداڵێ
جنێوبدا بەمیللەت وباب وکاکم
ئەگەرگێلە ونەزانێکی کۆنەپەرەست
مێژووی درۆم بۆبنووسێ
ئەگەر لەرۆژی جەژنێکدا
رووت وقووت بن منداڵانم
ئەگەر رەنگی خۆت بگۆڕی و
فریوبدەی هاوڕێکانم
ئەگەر لەچوار دەوری مندا
هەزار دیواران هەڵچنی
ئەگەر رۆژگارم لەخاچی پەستی بدەی
بەلام ئەی دوژمنی هەتاو!
لەگەڵ تۆدا پێک نایەم من
هەتادوایین ترپەی دڵم
خۆرادەگرم.

* * *

دوژمنی خۆر
بڕوانە دیمەنی بەندەر
موژدە دەری ئازادی یە
بەزم وهەراو
گوڕەی سروودی شادی یە
لەئاسۆدا،
بادەوانەکان دەبینم ڕادەهەژێن
سینگیان ناوە بەدەم باوە
ئەوەگەمی یەکەی (ئۆلیسم)
لەدەریای ون بوون دێتەوە
ئەوەتاوی منە هەڵدێ،
ئینسانی پەرییوەیە دەگەڕێتەوە
سوێندم بەچاوی ئەودوانە
هەرگیز لەگەڵتان پێک نایەم،
هەتادوایین ترپەی دڵم
خۆرادەگرم.

# سەیدی ئەورامی

محەمەد
عارف پەناه

"سەیدی" ناوی "مەلا محەممەدسولەیمان" کوڕی "حاجی سەیدمەحموود"ە و لەگوندی "خانەگا" لەدایک بووە .

سالی لەدایک بوون و وەفاتی سەیدی ئەورامی زۆر روون نیە . بە پێی لێکۆڵینەوەی زانایان بەتایبەتی "محەمەددەمین کاردۆخی"کەدیوانی سەیدی بڵاو کردۆتەوە سەیدی لە نێوان ساڵانی ١٢٠٠ تا ١٢٦٥ی کۆچی دا ژیاوە ومالی لە هەورامانی تەخت بووە وخانووبەرەکەی ئێستاش هەر ماوە. سەیدی لە هەورامانی تەختدا مەلایەتی کردووە و بە ئیش و کاری فەلاحەت و باخەوانی ژیانی بردۆتە سەر. لەو ماوەدا دەرسی بەشێخ عوسمانی تەوێڵەش گوتووە و لەتەمەنی ٦٠ سالێدا دەبێتە خەلیفەی شێخ. لە وەرامی شێخدا کە داوای لێکردووە ببێتە خەلیفە ، نامەیەکی بە شیعر بۆناردووە وشیعرێکی بەناوی "یا شێخ سەنعانم" گوتووە:

ئەو رووداوە پاش ئەوە بووە کە مرید و سۆفیەکانی شێخ لە هەورامانەوە دێن بۆ تەوێڵە و بە شێخ دەڵێن " قوربان سەیدی بۆ خەلیفە نابێ و هەر بە بەژناندا هەڵدەدا ".

سەیدی لە هەڵبەستی "یاشێخ سەنعان"م دا دەڵێ :

**گشت جەمەن فیشتەر حاڵشان فەنان**
**داخم هەر ئیدەن هەر پەی من مەنان**
**ئەر عاشق نەبان یەکسەر مەلاوشێخ**
**فتوا بۆ سەیدی سەربڕان بەتێخ**

یانی: هەموو لەمن زیاتر حالیان خەراپە.

بەداخەوە هەر دەزانن لۆمەی من بکەن.

ئەگەر مەلا وشێخەکان هەموو عاشق نەبان سەیدی فتوای دەدا کە سەری ببڕن .

سەیدی وەک گوتمان ناوی"مەلا محەممەد سولەیمان"ە و نازناوی "سەیدی"یە کە مەبەست نێچیرە و ریشەی عەرەبی هەیە لە شیعرێکدا دەڵێ :

**عەرزەداشت بەندەی دڵ مەندو**
**رەنجوور**

"صیدی دامی عشق بە (صیدی)
مەشهوور

یانی:
ئەم بەندە دڵ شکاوە عەرز وحاڵی هەیە لە خزمەتت.
ئەو بەندەش بەداوی ئەوینەوە بووەو بە سەیدی مەشهوورە .
لە شیعرێکی فارسیدا دەڵێ :

**الهی صیدیم کن صید جنت**
**اگرچه باد عصیان صد هزارم**

لە هۆنراوەکانی سەیدی دا باسی خەت و خاڵ وئەگریجە وپەرچەم زۆرە و زۆریشی باسی خودا وپێغەمبەر کردووە .. دیارە باس کردنی خەت وخاڵ لە لایەن سەیدی یەوە باسی عیرفانە و مەبەستی

سەیدی بە "هاڕە" دەڵێ لە کاتێکدا دەستت لە دەستی شیرین دایە هاوارت لە چیە. پاشان نسحەتی دەکا کە دڵ نەدا بە شیرین چونکە پەیمان شکێنە. "هاڕە" لە وەڵامدا دەڵێ هاواری منیش هەر لەبەر بێوەفایی وپەیمان شکێنی شیرینە. لە کۆتایی شیعرەکەدا سەیدی بە خوێنەر دەڵێ کاتێک بەردی هاڕە بە ئەوینی شیرین دەسووتێ من کە لە گۆشت وخوێن دارێژراوم چۆن نەبم بە ئاو !

**"هاڕە" سەختەنی، "هاڕە" سەختەنی**
**تۆ خۆ کەمقیمەت سەنگی سەختەنی**

**جای بلێند ئیقباڵ،ساحێب بەختەنی**
**یار ئامان وەڵات ،جەهد و جەختەنی!**

دنیایی نەبووە. لەزۆر جێگەش باسی دیمەنە جوانەکانی کوردستان دەکا .
"سەیدی" هەورامی پارچە شیعرێکی بەناوی "هاڕەسەختەنی" هەیە. لەم شیعرەدا وت وویژی "سەیدی" لەگەڵ "هاڕە"(دەستاڕ) کە "شیرن" لەپای دانیشتووە ودەیگێڕێ باس کراوە. ناوەرۆکی عاریفانە وبەرزە.

**تراشیدەی دەس، سەر ئۆستایی باش**
**جەستەی پڕزەخم قوڵنگەی سەنگتاش**
**یادگاری ئۆستای قەدیم زەمانە**
**دەس ئاسی دەسکێش خەیاتی خامە**
**چمان تاشیان تێشەی فەرهادی**
**دەستش جە نەمام داری شمشادی**

ئارۆ قیبلەی من بە لەنجەولارە
تەشریفش وەلای تۆ ئامان "هاڕە"

ئاگات بۆ دەستش بە پەنجەی یارەن
پەنجەش ریش نەبۆ هاڕە هاوارەن!

دیم شیرین نیشتەن دانەمەدوپێش
هاڕەش هارکەردەن دەورمەدونەوێش

مەگیلۆ بەدەور چون چەرخ چەپگەرد
هەیاهووش گەرمەن مەنالۆ جەدەرد

شیرن بەسەتناز مەکێشو دەستە
دانە مەدوپێش چون ئاوات وەستە

دانەش مستانی چون ستەمکاران
مەکەریش وەگەرد تۆتیای شاران

تاقەت شی جەلام واتم ئەی " هارە"
بە مەودای ئەلماس پارە پای پارە

تۆدەست شیرن دەستە کێشتەن
ئاواتت بڕیا نالەی چێشتەن

با من بنالۆ رۆژان تا شەوان
زەدەی هیجرانم دەردم بێ دەوان

هاڕەی هەراسان هەرزەی هەرزە گێل
وەس دەور دەر نەوێت چون دێوانەی وێڵ

ئانە شیرینەن دڵبەر، دڵستان
دڵ جێت مەسانۆ مەکەرۆت داستان

چەنی کەس تاسەر هەرگیز یارنیەن
یاری ساحێب شەرت وەفادار نیەن

هەر کاتێت زانا هۆریزا بەقەست
چون بێ بەینەتان جەتۆش کێشا دەست

شی بەماوای ویش تەشریف بەردەوە
تۆش ئاستی بەلای داخ ودەردەوە

کۆتا بێ سەداو نەعرەتەو دەنگت
بێ قیمەت گنای کەساس بێ سەنگت

بەو دڵەی پڕسۆز مەینەت بارەوە
پێچیای بە دەرد دووری یارەوە

ئەوسا چەنێ زام بێدەوای خەتەر
مات مەبی بێدەنگ جەسەیدی بەتەر

* * *

وەڵای هارە:

سەیدی عارنیەن سەیدی عارنیەن
هەرکەس عاشقەن نالەش عار نیەن

ئێمەیچ نالەمان خۆ بێکار نیەن
کەس جەدەردی کەس خەوەردار نیەن

منیچ دێوانەی خاڵی شیرینم
پابەندی تای زولف بۆعەنبەرینم

بەڵام ئێد شیرین ئەیامان نیەن
چون خواجەی غەمخوار غولامان نیەن

هەرگیز جەنی کەس تاسەرنەشاتەن
شەرتش، ئیقرارش، وەفاش یەک ساتەن

ئەوسا کە شیرین مەکێشو دەستم
ماوەرۆ بەسۆز زامانی خەستم

جە خەوفی لواش جەستەم نەلەرزەن
هەی هاوار، هەی داد، هەی هانام بەرزەن

* * *

یاران یەسەنگەن جەستەش حاشاکەن
جەستەی مەینەت بار من تەماشاکەن

سەنگی یە تەورە مەسوچۆ بەتاو
دڵ قەترەی هوونەن چۆن مەبۆ بەئاو

"سەیدی" جەهیجران شرحی جەمین لال
ساپەی چێش نەبۆ بەکۆگای زووخاڵ ؟

مێژوو وێنەی ئاوێنەیەکی روون وخاوێن وبێ گەرد پێویستی هەر گەلێکە، ئەوەش بەویستی مرۆڤ نیە بەڵکوو هەر گەلێک چ بیەوێ چ نەیەوێ خاوەنی مێژوو، فەرهەنگ ،ئەدەب فۆلکلۆر و قانوونە. جا بەختەوەر گەلێکە کە ئەرک و رێزی مێژووی بۆ روو ن بۆتەوە. پیاوانە دەستی داوەتە قەڵەموورابردووی، خۆی نووسیوە وبۆداهاتووش پرۆگرام وگەڵاڵەی داڕشتووە وکۆڕی تایبەتی بۆتەرخان کردووە.

دیارە مێژوو نووسین بۆ ئەمسەردەم و داهاتوو کارێکی گران نیە چوون مێژوونووس بە چاوی خۆی کارەسات و بارو دۆخی دونیا دەبینێ وبەیارمەتی وێنە وفیلم دەیان شت وەکی راست دەخاتە سەر کاغەز.

ئەگەرچی بەداخەوە هۆی ئاڵ وگۆڕی بیروڕەوشت ئاکار و ئاکامێکی وای هێناوەتەگۆڕ کە مێژوونووسیش لەنەخشاندنی ئەو تووشی هەڵە بێ و بە ئەنقەست مێژووی هاوچەرخ وداهاتوو بە پێچەوانە بنووسێ. ئەم جۆرە مێژوونووسانە روو رەش دەبن وباریان ناگاتە جێ.

بەڵام سەبارەت بە رابردوو بە تایبەتی لە کوردستاندا خەڵکی کورد هێشتا خاوەنی مێژوویەک نین کە حیسێبی لەسەر بکرێ و هەموو شتێکی بەراستی و دروستی نووسیبێ. سەدان یا باشترە بڵێین هەزاران ساڵ مێژووی گەلەکەمان لە تارمایی مێژووی دونیادا ون بووە وئێستا جگە لە سەدان قەڵا و تەپۆڵکە و شوێنەواری ئەوتۆ هیچ بەڵگەو نووسراوەی وامان نیە کە بۆمان دەربخا بە دروستی ئێمە کێین. رابردووی ئێمە چۆن بووە؟ یەک دەنووسێ کوردەکان لەنژادی مادن یەکی دیکە دەنووسێ نا وانەبووە. هێندێک ناوی کاردۆخ و لۆلۆ تەنانەت جندۆکەشی بۆرێک دەخەن و شتی لێ دروست دەکەن بە ناوی کورد .فیردەوسی دەنووسێ کوردەکان لەدەست زوحاکی هەڵاتوون، یەکێکی دیکە دەنووسێ نا وانیە باپیرە گەورەی کوردان کوڕی حەزرەتی نووحی نەبی (د.خ) بووە وکورد لە تۆرەی* ئەون، ئەوانەی کتێبە مێژوویی یەکانیان خوێندۆتەوە چاکی تێدەگەن.

ئێستا تا ئەو جێگایەی من دەزانم ئەو کتێبانەی بەناوی مێژووی خەڵکی کورد ناسراون بریتین لە:

١- شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی.

٢- کورد وکوردستانی مامۆستا ئەمین زەکی بەگ

٣- کورد وکوردستانی خوالێخۆشبوو ئایەتوڵڵا مەردووخ.

٤- حەدیقەی ناسریەی میرزا عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار.

٥- کورد و نیژادی ئەو لەنووسینی رەشید یاسەمی.

٦- کورد وکوردستانی واسیلی نیکتین .

٧- مێژووی ماد نووسراوەی دیاکۆنۆف رۆژ هەلاتناسی سۆڤیەت .

٨- کورد وکوردستانی دوکتۆر کەماڵ مەزهەر ئەحمەد بەزمانی عەرەبی

٩- کورد وکوردستانی بەدرخان (بلەچ شێرکۆ)

١٠- مێژووی ئەردەلانی مەستوورە.

١١- کوردستانی حەبیبوڵلا تابانی .

١٢- مێژووی سۆفی گەری لە کوردستان .

١٣- مێژووو جوغرافیای بانە مامۆستا رئوفی تەوەکولی

١٤- کوردستانی مامۆستا کەریم زەند.

١٥- سەرنجێکی مێژوو و فەرهەنگی کوردستان بەقەڵەمی نووسەری ئەم وتارە.

١٦- کوردستان و ئیمپریالیزم نووسراوی عەزیز ژیان .

١٧- تالانی زێویەی سەقز نووسەر رەشید کەیخوسرەوی.

١٨- کوردەکانی خۆراسان لە دوو بەرگدا بەقەڵەمی کەلیموڵلا تەوەحودی .

١٩- کۆماری کورد وەرگێر سەیدمحەممەدسەمەدی

یەکەم سەرنجێکی شەرەفنامە دەدەین کە تا ئێستا بەزمانی فارسی ، عەرەبی، رووسی ،فەرانسە، کوردی و... چاپ کراوە . بەراستی مامۆستا هەژار بە وەرگێرانی ئەم کتێبە بەنرخە خزمەتێکی گەورەی بە گەلی کورد کردووە.

مامۆستای نەمر (هێمن) وتارێکی لە پێشەکی کتێبەکە نووسیوە کەسەبارەت بەوە دوکتۆرکەماڵ مەزهەر ئەحمەد لەکتێبی مێژوویی خۆیدا نووسیویە ئەموتارەی مامۆستا (هێمن) دەبێ لە داهاتوودا ببێ بەپێشەکی مێژووی گەورەی کوردستان

دیارە پیاوێکی گەورەی وەکوو شەرەفخان لەسەردەمی خۆیدا هەنگاوێکی هەرەبەرز و جوان وبەکەڵکی هەڵێناوەتەوە ئەگەر کەموکووریشی هەبێ، کە هەیەتی، جێگای ئیراد نیە چون لەو بارو دۆخ و سەردەمەدا تەرخان کردنی دەفتەرێکی گەورە بۆ کوردستان هەر ئەوەی لێ پەیدا دەبوو. دیارە بەر لە شەرەف خان زانا و بلیمەتی گەورە لەنێو کورداندا هەڵکەوتوونە بە تایبەتی دوو مێژوونووسی گەورەی ئیسلام وەکوو ئیبنی ئەسیر وئیبنی خەللکان و هەر وەها جوغرافیا زانی گەورە یاقووتی حەمەوی، خاوەنی معجم البلدان،دەیانتوانی بە نووسینەوەی مێژووی گەلی خۆیان خزمەتێکی باش بە گەل وولات بکەن . بەلام بەداخەوە کەمتەرخەمیان کردووە و توانای خۆیان لەخزمەت فەرهەنگی بێگانەناوە .بەلام هەستی نەتەوایەتی هەر نەفەوتاوە و لەنێو کورد دا شێرەژنی وەک رەئیسەی کورد دایکی نیزامی گەنجەوی هەڵکەوت. پاشان میرشەرەفخان قەڵەمی خۆی بۆ مێژووی کوردتەرخان کرد وئەرکی خۆی بەجێ هێنا .

بەلام ئەمە جێگای باسە کە بۆچی لە سەردەمی شەرەفخانەوەتا زەمانی مامۆستا ئەمین زەکی کەسێکی دیکە لەخەڵکی کورد هەڵنەکەوت کە کتێبی مێژوویی بنووسێ ؟چووزانم رەنگە کەسانێک هەبووبن بەلام دەفتەر ونووسراوەیان کەوتۆتە بەرهێرش وپەلاماری داگیرکەرانی کوردستان و دەسەلاتداران وتێدا چوون....
وئێستا ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە شەرەفنامە تا سەردەمی ئەمین زەکی تاقانەیە.

مامۆستا بە قەڵەمی جوانی خۆی وبەیارمەتی وەرگرتن لە هەستی خاوێنی کوردایەتی وپیاوەتی مێژوویەکی جوانی بۆ نووسیوین کە دەتوانین بنووسین تا رادەیەک چاکە یا ئەو مێژووانەی دیکە

هەموو لەمێژووی ئەمین زەکی خەراپترن کەوابوو ئەمە چاکەکەیانەدیاکۆنۆف مێژووی مادی نووسیوە و کەریم کەشاوەرز کردوویە بە فارسی وبورهان قانع بەکوردی وەریگێڕاوەتەوە.

کوردستانی واسیلی نیکتین وەک محەممەدی قازی لە سروەدا گوتبووی بووە بە فارسی، جێگای ڕێزە بەڵام ئێستا پرسیارێکی دیکە دێتە پێش ؛ بۆ مێژووی کوردستان تەلیسم کراوە کەلە شەرەفخانەوە دوای چەند سەدە بگا بە ئەمین زەکی بەگ وهیچکەسی دی ؟ خۆ پاش ئەمین زەکی مێژووی دیکەش نووسراوە.. ئەوەش بڵێین من نەعەرەبی دەزانم ،نەمێژووە عەرەبی — یەکەی دوکتور کەماڵ مەزهەرم خوێندۆتەوە. بەڵام بەین و بەینەڵڵا ئەوانەی عەلی ئەکبەری وەقایع نیگار و رەشید یاسەمی بە ناوی مێژوو نووسیویانە هەڵە و پەڵەیان زۆر تێدایە و وێ ناچن .

بۆ وێنە رەشید یاسەمی بە پووڵ وەرگرتن لە رەزاخانی پالانی بە بەرتیل ئەو کتێبەی نووسیوە کە بسەلمێنێ کوردەکان ئاریایین لەگەڵ ئەوانی دیکە بران و هەوای ئەولاو ئەملا لە کەللە وەدەر بخەن، جل و بەرگ ودەفتەری خۆیان لابەن، وەک ئورووپایی شەپکە لەسەر نێن وهەوسار ببەستن .

خوالێ خۆشبوو مەردووخ مێژووی ئاغاوەتودەرەبەگ ودەسەڵاتدارە خاوەن سامانەکانی بە چەشنێکی زۆر هەڵوەشاوە ونالەبار نووسیوە. تازە دەردەکەوێ کە زۆرتری لە رووی ، حەدیقەی ناسری یەوە نووسیوە و سەیر لەوەدایە ناوی کورد وکوردستانی لێ ناوە بەڵام هەموو ئی شاری سنەیە، سەبارەت بەسەقز نووسیویە ئەوشارە پێنسەت ماڵە و پێنج هەزار کەس نفووسی هەیە هەر لەقەبێکی لە سنە هەیە، لەسەقزیش هەیە !

نازانم ئەو لەقەب و شتە چ نان وئاوێکی تێدا بووە کە بە گوتەی خۆی کاتێک دەگاتە محەممەد عەلی شا ولێی دەپرسێ چ شتێک بۆ خەڵکی کورد داوا دەکەی حەزرەتی مەردووخ دەفەرموێ قوربان فەرمانی مزگەوتی والیم پێ بدە بۆ نەسیرول ئیسلام چەند تۆپ عەبا و دوازدە

لەقەبیشم بدەیـــە بـــۆ
باقی یەکەی ؟!!

خوێنەری بەڕێز خـــوا نەخواستە من رقـــم لە مـەردووخ نیە.بەڵام مێژوو، نووس چۆن وادەبێ ؟ ئێوە دووبارە سەرنجێکی مێـژووی مـەردووخ بدەن، دەبینن کە ئەم حەزرەتـە لە سەردەمی حکوومەتی شەریفوددەولـەدا کە بە یارمەتی هێــزی قەزاق وفرۆکەی بریتانیای داگیرکەر حکوومەتی هۆزی گەڵباخی تێک رووخانـد و یازدە کەس لـە سـەرۆک هۆزەکانی گـەڵبـاخـی و مەندەمی وشێخ ئیسماعیلـی لە دەروازەی شاری سنە لە قەنارە دران، هەر ئـەو شـەوە مـەردووخ بـە پێی نووسراوەی خۆی لـە مێژووەکەیدا شەریفوددەولـە و ئینگلیسەکان وقەزاقەکان بانگ هێشتن دەکا جێژن دەگرێ کە حکوومەتی ئەشرار تێک رووخا وبەسزای خۆیان گەیشتن ....؟! پیاوی وا دەتوانێ مێژوو نووس بێ ؟ ئـەوجۆرە مێژوویە بەکاری چ دێ ؟

کەی ئەوە ئینسافە. کـەی گەلباخی ئەشرار بوون ؟ لـە حاڵێکدا لە شەرەفنامـەدا نووسراوە حکوومەتی گەڵباخ تا سەردەمی قاجار پترلە ٣٠٠ ساڵ پێشینەی بووە...

حەدیقەی ناسریە ساڵی رابردوو لەلایەن مامۆستا رەئۆفی تەوەکولـی لـە کتێبخانە کۆنەکەی مەلیکی تاران هاتەدەر و چـاپ کراوە هەر لەو تاریخـەدا مێژوونووس بـۆ ئـەوەی ناسرەدین شای قاجار خەڵاتی بکا خەڵکی بانە، گـەڕووس تیلەکۆ وگەڵباخی بە وەحشی و بێ تەربیەت ناو دەبا جابۆیە نووسەری ئەو وتارە هاتۆتـە سەر ئەو باوەڕە، کە بە هەموو کوردێکـی خاوەن بیروزاناوبە هـەموو دەزگایەکی کە هەست بـە بەرپرسیدەکەن را بگەیەنێت. کە براگیان، ئاغا ،مامۆستا وەرن ومەحزی رەزای خـودا باسک هەڵماڵن و بـــە یارمەتی وەرگرتـن لـە سەرچاوە مێژوویی یـەکانو نووسراوەکان وئەو کتێب و بەڵگە و کـەرەسانەی هەت

مێژوویەکی موعتەبەر بۆ خەڵکەکەتان بنووسـن تـا ئێمەش شەرمـەزاری خاک و وڵاتی خۆمان نەبین وداهاتوان لەجیاتی لەعنەت، رەحمـە ـ تمان بۆ بنێرن!.

تاکەی ئـەم هـەمـوو نووسەر وشاعیرو لێکۆڵەرو مەلا وعالم وزانای کـورد بۆی دانیشن و مینۆڕسکی و دیاکۆنۆف وفلان رووسی و فەرانسەوی وبریتانیایـی و ئەمریکایی مێژوومان بـۆ بنووسن ؟! خۆمان شەگەمانە یا هیچ نازانین ؟ ئـەگەر نازانین بە چ روویـەک خۆمان بەنووسەر و شاعیرو زانا وپسپۆر داناوە؟ چۆن ئەو جوربزەمان نوانـدووە کتێب بنووسین و شیعـر دابنێین و داوای مـافـی فەرهەنگی خەڵک بکەین ؟

ئەگەر دەزانیـن زۆر عەیبە کە ئێمە بەو شان وباهۆ وئیمکانات وکەرەسەو شت وەکە هەر مووچـەخۆری میرشەرەفخانی پێنج سـەدە لەمەوبـەر و چەند بێگانە بین . یا دڵمان خۆش بێ ئەم زێڕە قەڵبانەمان لـە سەر تاقە داناوە وشانازی پێوە بکـەین !

دەهەستن ئەی پیاوە زاناکان و هەستیارانـی کوردستان مێژوویەک بنووسن بۆ وڵاتەکەتان لەسەرخەتێکی راست ودورست وئەمانەت . بە خەڵکی ئێستا و بـە منداڵەکانتان وبەداهاتووان؛ بە نـەوە ونەبیرەونەتیجە ـ تان بفـەرموون ئێمـە کێیـن ؟ کاردۆخیــن ؟ لۆلۆین ؟ کاسین ؟ کوڕی نووحین ؟ جندۆکـەین ؟ ئادەمیزادین ؟ یاکێ ین ؟

ع. سەمەدی

# عیرفان ٢

عیرفان مەکتەبی هەرە پێویستی مرۆڤ، بەتایبەتی مرۆی ئەم سەردەمەیە. عیرفان بەپێچەوانەی زۆربەی هەرە زۆری مەکتەبەکانی دیکە "خۆبەزۆر زانی، هەوا، فەرمانڕەوایی بەسەر یەکداکردن، درۆ، فێڵ، ئیشتیای سەرۆکایەتی وخەڵک لەژێر چۆک نان و..." نەبووەو نابێ.

ئەگەر بێتوو تاریفێک بۆ ئەو مەکتەبە بدۆزینەوە دەبێ لەنێو قسەکانی رێبەوانی عیرفان (یانی"عارف"ەکان) دا بگەڕێین، چونکە جوانترین و باشترین ونزیکترین تاریف بەو مەکتەبە هەر لە لایەن ئەوانەوە گوتراوە، چون، چ کەسێک وەکی ئەوان لە نێوەرۆکی عیرفان گەیشتووە ؟!

"شێخ ئەبولقاسمی قوشەیری" دەڵێ: "الدخول فی کل خلق سنی والخروج من کل خلق دنی".

هەڵبەت تاریف لە عیرفان زۆرە، بەڵام ئەگەر هەزاریش بێ هەر یەکە بەچەشنێک دێتەوە سەر ئەو تاریفەی"قوشەیری" عارفەکان پیاوی عەمەل بوون نەک قسە. ئەوەی ویستوویانە بە خەڵکی بڵێن بەکردەوە گوتوویانە. هەر بۆیە کەسێکی وەک شەمسی تەورێزی تەنانەت لاپەرەیەکیشی لەدوا بەجێ نەما. ئەوانەش کەدواون و نووسیویانە، کورت دواون و کەمیان نووسیوە. بەڵام بەم کەمی یە هێشتا ماسی بیر و خەیاڵ شەکەت دەبێ ومەلەوانی ئەندیشە لەپێ دەکەوێ و هیچیان ناگەنە بنی.

عارف حوکمی تەکفیروخراپە لەسەر کەس دەرناکا، بەڵکوو دەگەڕێتەوەسەرخۆ و هۆی ئەم خراپە لە خۆیدا دەدۆزێتەوەو لەنێوی دەبا. بەڵێ بێ شک ئەگەر بێتوو هەرکەسە لەجیاتی چاو بەخەڵک هەڵێنان و لە مەردم خورت بوونەوە، لەئاکاری خۆی بڕوانێ وبۆ چاک کردنی کۆمەڵ لەخۆیەوە دەست پێ بکا هەرچی پیس وناحەزی یە ریشەی وشک دەبێ. وەک مەولانا دەفەرموێ:

ای بسا ظلمی کە بینی در کسان
خوی تو باشد در ایشان ای فلان
اندر ایشان تافتە هستی تو
از نفاق وظلم وبدمستی تو

گرینگترین سەرچاوەی بیرو رای عیرفانی کتێبی "مەسنەوی مەعنیەوی"یە کە مەولانا جەلالەددینی مەولەوی" عارفی گەورەی ئێرانی لەساڵی ٦٥٧ی کۆچی مانگیڕا تا کۆتایی تەمەنی لە شەش بەرگدا کە نزیکەی ٢٥٦٣٢ بەیتە داینا وە

چرای عیرفان "ئەوین"ە و لەم مەکتەبەدا گەورەترین بایەخی پێ دەدرێ. لێرەدا پەنجاو دوو کەلام لە سی و یەک عارفی گەورە هەڵبژێراوە کە هەریەکە بەتەنێ دەتوانێ ببێتە هۆی خێر و خۆشی و بەختەوەری.

مەحموود ئیبنو عوسمان
مرۆ سێ دەستەن:
یەک، پیاو
دوو، نیمچە پیاو
سێ، ناپیاو
وەبەڵام:

پیاو ئەوەیە کە ببەخشێ ووەر نەگرێ!
نیمچە پیاو ئەوەیە کە ببە-خشێ و وەرگرێ!
ناپیاو ئەوەیە کە نەبەخشێ و وەرگرێ!

رەسووڵی خوا فەرمووی:
- لە هاونشینی مردووەکان خۆ بپارێزن!
پرسیاریان کرد:
- یا رسولەڵلا مردوو کامەن؟

فەرمووی :
ـ دەولەمەندەکا ن .

ئیبرا هیم ئیبنو موستەمەلی
"سری سقطی" (خوا نا سی گەورە )
گوتی :
رۆژێ چەندجار سەیری ئاوێنـە
دەکەم ، دەترسێم
رووم رەش بووبێ !

● ● ●

شێخ قوشەمیری
ئەوەی بمرێ ولەجیها ن دەرچێ
مردوو نیە .
مردوو ئەوەیە لەژیا ندا بمرێ

● ● ●

ئەفلاکی :
کە ..مەولانا شەمسەدین ،دلـی
لە کەسێک دەیەشا ،
ئاوا ی تووک لێدەکرد :
خوا تەمەنت درێژ ودا رایەتیت
زۆر کا !

● ● ●

هجویری :
سۆفیا یەتی ،ئەمرۆ ناوێکـی
بێ نێوەرۆکە ،
و دوێنێ نێوەرۆکێکی بێ نـاو
بوو .
شێخ ئەحمەدی جام
ئێمە روح لـە ئـەشکـەنجـە
داوێین ،
ودڵ هەڵدەقرچێنین ،
ولە دەریای حەقیقەتدا مەلـە
دەکەین ،
ویاقووت و گەوهەر و شەوچـرا
هەڵدێنجین ،
ولە کۆشی ئێوەی دەکەین
تاکوو لە تاریکی دەرچـن و
لارێ نەبن ،
وتەنیا بەدوعا یادما ن بکە ن
وبەس!

● ● ●

موحەممەد غەزالی
یەکێک بە "سهل تستری" گوت :
ـ دز مالەکەی بریـسوم و
دەسمایەکەی بردووم.
گوتی : ئەگەر شەیتا ن دلـی
بریبا ی وئیمانی بردبای چت
دەکرد ؟ !

● ● ●

شیخ ئەحمەدی رۆمی
قسەی حەق ،
دەبێ ئاشکرا وبلندبگوترێ ،
نەک لەژێر لێفەوبە ورتە !

● ● ●

عەزیزەدین نەسەفی
مرۆ ،
بەتەواو و ناتەواو ،
زانا و نەزان ،
ئەمیر وژێردەستەوە
گشت زەلیل و بێچارەن ،
وبەنامرادی دەژین !

● ● ●

ئەفلاکی :
سەلا لەو کەسانەی ،
چاویا ن بـەخـەوە و دلـیـان
نوستووە !

● ● ●

شێخ ئەحمەدی جام
وێژەر زۆرە و خاوەن ماناکەم

● ● ●

ئیمام محەممەدی غەزالی
ئەمرۆ ،پازدەساڵ بەسەر ئـەم
سێ (نذر)ەمدا تێدەپەرێ :
یەک ،باربۆی هیچ سولتا نێـک
وەرنەگرم !
دوو ،بۆ دیدەنی هیچ سولتانێک
نەچم !
سێ، لە پێلە ودمەتەقە خـۆ
بپارێزم !

● ● ●

شێخ ئەحمەدی جام
ئێمە لەدانا ن و نووسینی ئەم
کتێبەدا ،خوێنی دڵ دەخۆین .
نووسەرەکا ن ،کتێبەکانیان لەم
کتێب ولەو کتێب وەردەگرن !
کەچی ئێمە ، لـە دڵەکانما ن را
دەیخەینە سەر کاغەز ،
نەلە کاغەزەوە بۆ کاغەز
خوێنی دڵ ئەوەیە !

● ● ●

ئیمام محەممەد غەزالی
" حەسەنی بەسری" دەڵێ :
پێشینانی ئێوە قورئانیا ن بە
کەلامی خوا دەزانی ،
بە شەو لێی فێر دەبوون و بە
رۆژ لە کاریا ن دێنا ،
ئێوەش لە "سەر وژێروبۆر"ەکەی
ئالاون و ماناتا ن داوە بـە
رواڵەت!

● ● ●

ئەگەر نەتانتوانی قسەکانمان
لێک دەنەوە ،
بزانن کەمانای سەرجەمیـان
تەنها یەک وشەیە ،
( شـەویـن) .

# کەوبار

سوارە ئلخانی زادە

بوو مەلێڵی بەیانی بوو، تەزوویەکی سارد بە لەشی کێو وچیادا ئەگەڕا، وە گاهێ گیای شلک وگوڵی کێوی چاوبەخەوی رائەچڵەکاند. مەحموود ماوەی سەعاتێک بوو چاوی نەترووکاندبوو و هەروەها روانیبووی بۆ باوکی کە بە هەڵپە* سەرنجی کەلەکەی پێشیانی ئەدا، مەحموود خۆشی نەی ئەزانی چۆن وا کوت و پڕ ئەو بیرەی کەوتبووە مێشکێوە کە باوکی لە دڕندەیەک ئەچێ کە زگی برسی مەلاسی* زەوی

چاو برینە شوێنێک وەها کە پیاو لای وابێ ئەم جووتە چاوە یاهەر ناگەڕێن یا بە هەودایەکی نادیاری بە شوێنێکەوە بەستراون.

ناچاری یە کە هەزار بیر ئەخاتە مێشکی ئادەمیزا — دەوە، مەحموود بیری کردەوە کە ئەم روانینە بە هەڵپەی هەرگیز بە باوکی یەوە نەدیوە. ئەکاتێ کە دایکی نەخۆش بوو، چاوی نابووە سەریەک وباوکی چاوەروان بوو ئەو چاو هەڵبڕێ وەدەری خا، کە

هێشتا گیانی تێدا ماوە، نە ئەو جارە کە کۆرپەی برا گەورەکەی کە ئەبوو بە نەوەی باوکی خراباوەشی. کۆرپەیەکی ئێسک سووکی خوێن شیرین کە بۆنی شیر و گۆشتی زیندوو، لیباسی تازەی بە ئەسپۆن شۆراوی لێ ئەهات وەچاوی شینی پڕشنگێکی خستبووە سەر

کردبێ وچنگۆڵەی دادابێ تاکەی نێچیر ئەگاتە بەر هەڵمەتی. ڕەنگە نەبزووتنەوەی باوکی وبە گرمە روانینی ببوو بەهۆی ئەمە کە مەحموود وەها بێتە بەر چاوی، ئاخر سێ چوار سەعات بێ چاو لەسەریەک دانان و بێ وچان، بێ روانین بۆ ئەملا وئەولا، تەنیا

بەروانکەکەی*! بە کورتی مەحموود هەرگیز ئەم هەموو تاسە وهەڵپەی لە روانینی باوکی یا بەدی نەکردبوو.

مەحموود پڕ بەدڵ پێی خۆش بوو پاکانەی باوکی بکا! دەی جا چی بوو..... باوکم خێزانێکی زۆری بە ریشەوە بووە، منداڵی وردو درشت و سەروپێچکەی هەیە دایکم کەوتوو رەوتوو و ناسازە، ئەویش بۆ تێرکردنی ئەم هەموو زارە ئاواڵە وە زگە برسی یە ئەبێ هەوڵ بدا، هەوڵ بدا و بە هەموو لایەکا پەل بکوتێ! قەیدی چیە؟ کار کارە، چ سەودا وسەرەگری، چ سەپانی و دروێنەوانی وە چ راوکەری. باوکم بەو راو کردنە هەم بژیوی خۆمان پەیدا ئەکا وە هەم بە فرۆشتنی نێچیرەکان بە کەلە بەرەکانی تری ژیانمان رائەگا.

مەحموود لەدڵی خۆیا ئەی ویست ئەو مەبەستانە قەبووڵ کا، بەڵام ئەم روانینە بە هەڵپە! بۆ کوشتنی کەوی بەستەزمان ریسەکەی لێ ئەکردەوە بە خوری، هەموو شتێکی لێ هەڵئەوەشاندەوە، دیسان روانی یەوە باوکی، ریشی ماش و برنجی بە دەم، شنەی ساردی بەربەیانەوە ئالۆز ئەبوو، دەمو چاوی

گنجاوی و لەبەر تاو سووتاوی باوکی کەوتبووە سەر بەردێکی قەوزەگرتوو و بە هیچ بارێک لەگەڵ بەردەکە جیاوازی نەبوو . باهۆی هەڵکراو و رووتی لەگەڵ داری تفەنگەکەی ئەتگوت دوو بە شی یەک باسکن . ئەمانە هەموو چاریان ئەکرا، بەڵام ئەم روانینە کە بۆنی خوێن و رەنگی دڵ رەقی پێوە بوو شتێک نەبوو کە مەحموود لێی خۆش بێ. مەحموود لەبەر خۆیەوە گوتی :

بابە....وەگوێی گرت بۆ وەرامی باوکی دیسان بای ساردی بەیان بوو کە تۆزی خەوی لە چاوی وڵاتی خەوالوو ئەسڕی بەڵام باوکی مەحموود هیچ دەنگی لێوە نەهات . سینگی کە گیا نەرمەکانی شێلابوو ئەهەژا هاژانی مارێک لەبەر گەرمای هاوین، هاژانی سینگی دڕندەیەکی برسی کە بەشوێن نێچیرا رای کردبێ مەحموود بەرزتر هەرای کرد

" بابە، دیسان "

باوکی رووی وەرگێڕاوەو،وە- رامی نەداوە ، دەنگی مەحموود بە هەرای بابە بەرزتر بۆوە و کێوی ئەوبەر وەرامی داوە:

– بابە،بابە ، تەقەی تفەنگ هەستا و باوکی مەحموود نەڕاندی:

– یەک ، دوو، سێ چوار، پێنج،شەش، مەحموود هاواری کرد:

" بەسە ، بەسە."

چەند کەو کە هەریەک ساچمەیەکیان بەر کەوتبوو هەڵ ئەبەزین ، کەوێکیش باڵی شکاوی بەسەر،زەوی یا خێشکەی ئەکرد و خۆی رائەکێشا بۆ ژێر بنچە تووتڕکێک .باوکی مەحموود وەک تاوێرێک کە خلاری کەیەوە بە چەند باز و چەند سەرەنگرێ خۆی گەیاندە کەوە کوژراوەکان،چەقۆیەکی تیژی دەرهێنا وکەوەکانی سەر بڕی،خوێنی چەقۆکەی بە لکی پشتێندەکەی پاک کردەوە و نایەوە ناو گیرفانی، کەوەکانی جەللە کرد و لاقی بە پەتێکەوە بەستن و هەناسەیەکی کە لەمێژ بوو لەسنگیا قەتیس مابوو دا دەرەوە.مەحموود وەک خەڵفێکی ساوا کە لە بەرانبەر دارێکی پیرا شین بێ لەبەر دەمی باوکی چەقی و بەئەسپایی گوتی:

" بابە."

بابی وەرامی داوە:

"رۆڵەم"

مەحموود کوتی :

یەکێک بۆخۆمان دووی تریش بۆ فروشتن، ئەوانی ترت بۆ کوشت ؟

باوکی مەحموود لەپڕ هاتەوە بیری کە بە گوللەی دوایی دوو کەوی پێکاوە و ئەبوا حەوت کەوی سەربڕاوی پێ بێ . بە پەلە گوتی هەر لێرە بە رۆڵەم. لەبەر خۆیەوە گوتی :

" کەوە باڵ شکاوەکەم لەدەس دەرچوو، دەستی قوژبن پشکنی باوکی مەحموود بەناو تووتڕکەکانا گەڕا و بە کەلاکی کەوەکە هاتەدەر مەحموود کوتی :

– مندار بۆتەوە، بڕوانە پەڕە جوانەکانی شەلاڵی خوێنە.

باوکی بەڕقەوە کوتی:

– حەیف بوو، چەند قەڵەوە، پاشان بێ ئەوە قسەیەک لەگەڵ مەحموودا بکا ملی رێی گرت و بەرە و ماڵ بووە.

بەڵێ، دەمە و بەیان ئەی سووڕاند، چەند پەڕی نەرم تێکەڵ بە گەردە لوولێکی کەمخایەن بەرەو ئاسمان بەرز ئەبوونەوە و بە لەرینێکی بەئەسپایی ئەکەوتنەوە سەر زەوی . مەحموود ماوەیەک وەستا و تەماشای باوکی کرد ، تفەنگەکەی وەها گرتبوو ئەتگوت دەستی خۆیەتی و درێژتر بۆتەوە، هێشتا مەحموود لە گێژی رزگاری نەببوو کە دەنگی گر و پیاوانەی باوکی بەگۆرانی کەویار بەرز بووە.

# شەخس

حاجی رئووف سەلیمی

لە زۆربەی ناوچەکانی کوردەواری خەڵک باوەڕیان بەوە هەیە کە یەکێک لە یارانی پێغەمبەر (د.خ) یا یەک لە ئەولیای خوا لە نزیک وان نێژراوە.

لەسەر قەبرەکەخانووچکە و گومبەز ساز دەکەن یا وارِ*ش بەدەوری قەبرەکەوە هەڵدەچنن و سواڵە*ت و قاشوولە و بەردی سپی لە سەر دادەنێن و ئاڵای سەوز وسپی لەسەر هەڵدەدەن.

دارەکانی نابڕن ،لەزیانی مەڕو ماڵات دەیپارێزن. جا دیمەنێکی جوان و خەملێو پێک دێ.

دەڵێن هەرکەس توولە دار و ویشکەڵی شەخس بسووتێنی تووشی بەڵا دەبێ.

لە شەخسەکانی ناوچەی بانە داری بەڕوو و مازوو سەریان لێک ناوە وبوونە مێشەڵان کوڕوکاڵ شەوانە لەگەڵ یەکتر گرێو دەکەن کە هەرکەس بتوانێ لەسەر شەخسی ئاوایی نیشانەیەک بەجێ بێڵێ) زۆر ئازایە چون پێیان وایە تووشی خێو* جنۆکە و شتی وا، دەبێ.

هەر شەخسەناوی تایبەتی خۆی هەیە.وەکوو: **چیمەن عەبداڵ، سەوزەپۆش ،تاقەدارە ،کانی مراد ،داروەکازە، حەوتەوانان ،بابەسەبەتلوو پیرموحەممەد، پیر مەحموود شێخ بۆزان ،هەیوان ساری قوتبی یەقین ،شێخەسوور، شێخ چۆپان ،بابەشێخ، دایە شێخ، شێخەڕەش، کۆسەی هەجیج، بابەلاس ،یەحیای غەیب ،بابەگوڕگوڕ**، و.....

بابەگوڕگوڕ لە ناوچە نەوتەڵانەکەی کەرکووک دایە کە ناوچەیەکی کوردنشینە و لەبەر ئەوە لەخیزەڵانەکەی نەوت دەهاتەدەر وئاگریان دەدا،گڕی دەگرت ونەدەکوژاوە خەڵک پێیان وابوو ئەوە نووری مەزاری بابەگوڕگوڕە

ژنی نەزۆک بۆ منداڵان دەچوونە سەر ئەو شەخسە و دەیانگوت :

– بابە گوڕگوڕ هاتم
لەپڕ هاتم
بۆ گڕ هاتم
بۆ کوڕ هاتم

بەقسەی کۆنینەناسان ئاگرێک لە ئاورگەکانی ئێران لە فارس هەڵدەستا ودەکوژاوە. زەردەشتی یەکان پێیان وابوو موعجیزەی زەردەشتەو دەچوون لەوێ عیبادەتیان دەکرد. بۆیە زۆربەی ئاورگەکان لە ناوچە نەوتەڵانی یەکان ساز کراون.

بەڵام ئینگلیزی هاتن و لە کەرکووکی عێراق و فارسی ئێران نەوتیان هەڵێنجا. زانیان کە ئەمە موعجیزە نیە بەڵکوو نەوتە و دەتوانێ چەرخی سنعەتی دنیا هەڵسووڕێنی .

دەگێڕنەوە جارێک نوێنەرێکی مەجلیس لە چرچیل سەرەک وەزیری ئینگلیزی پرسی :" بۆچی ئاسیا وئەفریقا ئیستعمار دەکەن ؟"

چرچیل لە وەڵامدا دەڵێ :

"ئێمە ئیستعمارناکەین حەقی کەوی بوونیان لێ

دەستێنین ."

جاری وایە **چاک وپیر و مەرقەد** ونەزەرگەش بە شەخس دەگوترێ .

ناوی هێندێک لەشەخسەکانی کوردستان بریتین لە:

ناوچەی بانە: **کانی بەن** ،**شێخ برایم، چیچۆران درگاشێخان** ،**سوورین ناوە خەلیفە برایمی سماقان، شێخ مەلا قادری چەمپاراو سەید ئەحمەدی ساوان، چاکە سواری تاژان** ،**مەلا مووسای تەوەکول** ،**پیرمراد**،**سلەمان بەگ**

لەناوچەی سەقز: **شێخ برایمی بست**،**شێخ حەسەنی مەولاناوا ، پیر وێنس حاجی شێخ مستەفا**،**خەلیفە رۆستەمی حەوتاش ، شێخ عەبدولقادری دۆزەخدەرە ، پارسانی** ،**وێڵە**، **سەفاخانە**

لەناوچەی بۆکان :

**زەنبیل** ،**بورهان** ،**پیر محەممەدی بوغدەداغی، پیر سوڵتان** ،**حاجی شێخ گوڵی ناچیت** .

حەسەن زیرەک گۆرانی بێژی کورد لەگۆرانی یەکانی خۆیدا زۆر ناوی شەخسی بردووە .

هێندێک لەم شەخسانە زۆر بەناوبانگن و خەڵک لەرێی دوورەوە دەچنە زیارەتیان .وەکوو: **غەوسی گەیلانی** ،**وەیسی ماهیدەشت** و....

کۆمەڵ ناسی رۆژئاوا دەڵێن " شەخس پاشماوەی ئایینی **ناچرالیسم وئانێمسیم و تۆتمیسم**"ە. **ناچرالیسم** یانی ئایینی تەبیعەت **ئانێمیسم** یانی گیان پەرستی **وتۆتمێسم** یانی ریشەپەرستی .

دەڵێن رازاندنەوەی داری کاج لە جەژنی **کریسمەس**دا لە نێو هەرمەنی یان وشەم گراندن و هەڵواسینی ئاڵای سەوز و سپی ودانانی سواڵەت و قاشوولە وبەرد لەسەر شەخسەکان ومتفەرک وەرگرتن لەوان کە لە جیهانی پێشکەوتووی ئیمرۆشدا لە ئورووپا بەتایبەتی **یوونان و ئیسلا و ژەرمەن و ئیسکاندیناوی** یەکاندا دەبینرێ بەڵگەیەکە لەو ئایینە کۆنانە .

جێی شەخس وشوێنەواری شەخس لەئیسلامدا جیاوازە . بەگشتی باوەڕی فیرقەکانی جۆراوجۆری ئیسلام لەسەر ئەوە ساخ بۆتەوە کە زیارەتی شەخس دروستە.

نزیک بوونەوە لە پیاوی چاک، بەکەلکە و مردوو و زیندووی جیاوازی نیە .

خەڵک زۆریان باوەڕپێیە و فاتیحای بۆدەنێرن.

مردووی خۆیان لە دەور و بەری شەخس دەنێژن .خێرو بەرەکەت وکوڕ وکچ ولەش ساخی لە شەخس داوا ، دەکەن .خەڵک پێیان وایە هەر شەخسە ودمی جۆرە نەخۆشی یەکی بەدەستە .یەک بۆ باداری ،یەک بۆشێت بوون وفێ گرتن ،یەک بۆ نەخۆشی پێست ، یەک بۆ ژن و....

بۆ وێنە پیرمحەممەدی بۆکان بۆ باداری ونەخۆشی پێست بەناوبانگە .ئەم شەخسە مریشکی لەخۆ گرتووە .یانی دەبێ مریشک سەر ببڕی و خوێنەکەی ئامێتەی خۆڵی شەخسەکە بکەی ولە بەدەنی هەڵسووی.

خەڵک لەسەر شەخس پووڵ وشیرینی دەبەشنەوە کولێرەی چەور و شیرین بە رێبوار وهەژاران دەدەن کراسی هەتیو نەزر دەکەن. بەردی تەنک بە کێلی مەرقەدەوە دەلکێنن. ئەگەر پێوەی لکا ،ئەوە نەزەری قەبووڵ بووە دەنا هیچ

کڵ وبەردی شەخس ماچ دەکەن ولەسەرو چاویانی هەڵدەسوون و بە متفەرک لەگەڵ خۆیان دەیهێننەوە.

دەستە ونەزەر دەچنە پێش وهەرواش پشتا وپشت دەردەکەون .

سەرچاوە :

**١- کۆمەڵ ناسی دوکتۆر تەبیبی .**

**٢- بیروباوەڕ بە شەخسە دارینە نووسراوی مەلا هادی ئەفخەمزادە .**

... زانایانی بە ناو بانگی کورد ...

# میرزا جەوادی قازی

موحەممەد قازی

میرزا جەوادی قازی کوڕی سیهەمی خوالێخۆشبوو شێخ جەلال ونەوەی خوالێخۆشبوو میرزا ئەحمەدی قازی یە. لە ساڵانی نیزیک بە ١٢٦٠ هەتاوی لە مەهاباد یا سریلاوا لەدایک بوو. دایکی ناوی پیرۆزە خانم بوو.

میرزا جەواد دوو برای لەخۆ گەورەتری بوو کە یەکیان میرزا عەبدولخالەقی قازی ئیمام جومعەی شاری مەهاباد بوو ومیرزا سەعیدی قازی کە لە سریلاوا بە کاری کشت وکاڵ بەڕێ دەچوو

شێخ جەلال باوکی میرزا جەواد پاش بەینێک ژنێکی دیکەشی هێنا و بوو بە خاوەنی کوڕێکی دیکە بە ناوی ئەحمەد کە هەر لە منداڵی یەوە نازناوی "شێخ"ی بەسەردا بڕا بەو جۆرە میرزا جەواد برایەکی چکۆڵەشی بە ناوی "شێخ ئەحمەد" بۆ پەیدا بوو.

زۆرمان ئاگا لەژیانی منداڵی و لاوەتی میرزا، جەواد نیە. هەر ئەوەندە دەزانین کە شێخ جەلالی باوکی لە پاش لەدایک بوونی "شێخ ئەحمەد" هەموو روحم وعەلاقەی خۆی دا بەو منداڵە و مەیلی کوڕە گەورەکانی‌ناوبەجارێک فەرامۆش کردن.

میرزا جەوادیش وەک هەموو کوڕانی تایفەی قازی رۆیشتە مەکتەب و فێری خوێندن و نووسین بوو. پاشان لەمەدرەسەی فەقێ یان لە مزگەوتی شادەروێشدا دەستی بەخوێندنی " فقه و اصول ومعانی وبیان" کرد و چونکە لاوێکی بە فکرو تێبین بوو لەلای یەکێک لە کاربەدەستانی"نەخۆشخانەی ئەمریکایی مەهاباد " زمانی ئینگلیزیش فێر بوو. بەڕێچوونی بریتی بوو لە جیرەی کەمی مزگەوت وخۆی لە باوکی نەدەگەیاند.

نووسەری بەشێکی ئەم سەرگوزەشتە (محەممەدی قازی) دەڵێ:

رووداوێکی ئەو تەمەنەی دوکتۆر جەوادی قازیم لەبیر ماوە کە لە خودی خۆی بیستوومە و رەنگە ئەگەر بۆتانی بگێڕمەوە پێتان خۆش بێ.

خوالێخۆشبوو گێڕایەوە کە لەکاتی فەقێ یەتی لە مزگەوتی شادەروێشدا پێداویستی بە کتێبی " شرح رسالە اقلیدس" بە زمانی عەرەبی پەیدا دەکا و پارەی پێویستیشی نابێ کە لەبازار بیکڕێ. گۆیا قیمەتی ئەم کتێبە سێ تمەن بووە و دابین کردنی پووڵی وازۆر! بۆ فەقێ یەکی رەش وورووتی وەک میرزا جەواد کە بە دەگمەن قرانێکی پووڵ لە گیرفانی خۆیدا دیبوو زۆر زەحمەت بوو! مەیلی کڕینی ئەم کتێبەی نابوو کە لەپڕا خەبەریان پێدا شێخ جەلالی باوکی لەگوندەوە، هاتۆتە شار و لە ماڵی خوالێخۆشبوو میرزا قاسمی قازی باوکی خوالێخۆشبوو قازی عەلی و باپیرەی خوالێخۆشبوو قازی محەممەد دابەزیوە.

میرزا جەواد زۆرخۆشحاڵ بوو وبە پەلە پەل خۆی گەیاندە باوکی تا پارەی کڕینی کتێب وەرگرێ. لە پێشخانەی دیوەخانی ماڵی میرزا قاسمدا نۆکەری باوکی چاو پێکەوت .نۆکەر

مزگێنی بە میرزا جەواددا کە ئاغا بە پوولێکی قورسەوە هاتۆتە شار و تەنانەت بەنیازە دەزبەندێکی زێڕیش بۆشێخ ئەحمەدی مەلۆتکە بکڕێ . میرزا جەواد بە هیواو هومێدەوە لە باوکی وەژوور کەوت و سڵاوی کرد. میوانێکی زۆر خۆیی و بیگانە لەخزمەت قازی گەورە دانیشتبوون و بە قسەی خۆش خافڵ بوون و پێدەکەنین. حاجی شێخ جەلالیش لەو کۆڕەدا بوو. بە دیتنی جەوادی کوڕی زۆر خۆشحاڵ بوو و لەکار و بارو ژیانی پرسیاری کرد.میرزا جەواد هێندێکی باسی ژیان و کاروباری خۆی کرد و پاشان داوای دە تمەنی پووڵ لە باوکی کرد تا کتێبی پێویست و جل وبەرگ بۆخۆی بکڕێ و لە کۆتایی قسەکانیدا کوتی " ئاخر منیش مافێکم هەیە !".

وەک شتێکی ئەو رستەی دوایی قسەی زیادی بوو . چونکە هەر ئەم قسە بوو بەهۆی ئەوە باوکی جوابی

نەداتەوە وبەتووڕەییەوە بڵێ :

" ناماقوڵت کرد! کام ماف ؟ میراتی باوکت لە من دەوێ ؟"

باسی میراتی باوک بوو بەهۆی پێکەنینی دانیشتوان چونکە خۆی باوکی میرزا جەواد بوو. کاتێک شێخ جەلال ملی نەدا پووڵ بە کوڕ بدا میرزا جەواد، هەموو پەرژین و سنووری

دەرگا راوەستابوو. باوکی دەستی کرد بە جوێن دان و تەنانەت هەستا تەمێی کا. بەڵام جەواد وەدەرکەوت و باوکی لەجێگای خۆی دانیشتەوە بەم جۆرە ژیانی

ئەدەب وحورمەتی لەژێر پێ نا و بە جەسارەتەوە رووی لە دانیشتوانی کوڕەکە کرد و گوتی :

" ئاغاکان ! دەبینن کە باوکم چەند بێ ئینساف و بێ مولاحەزەیە. پوولێکی زۆری هێناوە تا بۆ کوڕە چووکەکەی کە ئێستا لە نێو پیسایی دا جینگڵ دەدا وپێی هەڵ نەگرتووەدەزبەند و خڕخاڵی زێر بکڕێ. بەڵام دە تمەنی لەمن وەچاوە کە دەمەوێ کتێب ولیباس بکڕم ئێوە بەوە دەڵێن باوک ؟"

جموجووڵ و هەرا هەرا کەوتە گۆڕ و هەموو بە نیگای پڕ تانەو تانووتەوە دەیان روانی یە شێخ جەلال میرزا جەواد لەبەر

فەقێ جەوادی قازی زۆر بە تاڵی رابرد تاقەزاو قەدەر یا هەڵکەوت درگای رەحمەتی بەسەردا کردەوە و میرزا جەوادە رووتە ئەو فەقێ فەقیرەی مەهابادی بوو بە دوکتۆر جەوادی قازی.

بۆ شی کردنەوە وبەر چاوخستنی باشتری ئەم رووداوە ناچارین باسەکەمان بگۆڕین و باسێکی گرینگ و سەرنج راکێش بێنینەمە گۆڕێ.خوێنەرانی خۆشەویست ئاگادارن کە بەشێک لە ئەدەبی جوان ودڵ بزوێنی کوردی ئەو بەیت وچریکانەن کە لەکۆنەوە ماونەوە و هەرکامیان سەرگوریشتەیەکی دڵداری،حەماسی وقارەمانەتی یا دینی دەگێڕنەوە. ئەو

بەیتانە بە شێوەی شیعری
ئازاد وسەربەخۆن وهێندێک
لەوان لەبابەت جوانی و
کێش و چێژەوە لە ئەدەبی
جیهانی دا کەموێنەن.زوربەی
ئەم بەیتانە دانەریان
دیار نیە و نازانین
کێ، کەنگێ، لە کوێ
گوتوویەتی. هەر ئەوەندە
دەزانین بەرە بەرە لە
سینگەوە بۆ سینگ و لە
دوورەوە بۆنیزیک هەڵدێراون
و گەیشتوونە ئێمە.

نەبوونی فەرهەنگی ڕێک
وپێک و بێ بەشی لەچاپ
و پەخشان نەیهێشتووە ئەم
بەیتانە لە کتێباندا کۆ
ببنەوە وبە دەستمان بگا.
تەنیا پیاوانی دەنگ خۆش
و بە قەریحە و خاوەنی
چێژی شیعر ئەم بەیتانە
فێر بوون و لە کۆڕ و
مەجلیساندا گوتوویانە.وێش
دەچێ جاروبار بە سەلیقەی
خۆیان هێندێک ئاڵ وگۆڕیان
لە بەیتەکاندا پێک هێنابێ
بەڵام ئەم ئاڵ و گۆڕە،
هەرگیز تەواوەتی قەوارەی
بەیتەکانی لەنێو نەبردووە
و ڕووداوەکان هەر وەک
خۆیان ماونەوە.

لە لایەن نووسەران و
زانایانی کوردەوە بۆ کۆ
کردنەوە وچاپ کردنی ئەم
بەیتانە زەحمەتێکی بایەخدار
کێشراوە بەڵام تەلاش و
تێکۆشانی ڕۆژهەڵاتناسان و
زانایانی بێگانە لەم
بەستێنەدا زۆر بەرچاوترە.
لەنێو ئەواندا بەتایبەتی
کاری ڕۆژەلێکوی فەرەنسی
وئۆسکارمانی ئەلمانی لە
هەموان گرینگترە.

ئۆسکارمان ڕۆژهەڵاتناسی
ئەلمانی کەزۆر گیرۆدەی
ئاسەواری فۆلکلۆرێکی کوردی
و ئێرانی بوو لە ساڵانی
١٩٠٣ یا ١٩٠٤ هاتە
مەهاباد و پاش ئەوەی لە
ڕێگەی وەرگێرانەوە-ئەویش
ناتەواو-سۆزەی جوانی و
قووڵی بەیتەکانی کوردی
کرد لێ بڕا خۆی کوردی
فێر بێ تا جوانی و ڕەزا
سووکی و لوتفی بەیان
ڕاستەوخۆ تێ بگا و نیازی
بە وەرگێڕ و وەرگێڕان
نەمێنێ.

بۆ فێربوونی زمانی
کوردی مامۆستای لە میرزا
جەواد باشتردەس نەدەکەوت
چونکە میرزا جەواد خۆی
ئەویندارى فەرهەنگ و
ئەدەبی کورد بووهێند
ێکیشی ئینگلیزی دەزانی
و دەیتوانی ئوسکارمان
باشتر تێ بگەیەنێ.

لێزانی ودڵسۆزی مامۆستا
وئیشتیای شاگرد بۆ فێر
بوون بوو بەهۆی ئەوە کە
ئۆسکارمان لەماوەیەکی زۆر
کەمدا کوردی ناوچەی
موکریان بەباشی فێر بێ
و ئەگەر لاوەکی نەبایە
کەس نەیدەزانی کورد نیە
سەیر ئەوەیە کەئۆسکارمان
تەنیا بە ساڵ و نیوێک
ئەو سەرکەوتنەی وەدەست
خست.

دوکتور جەوادی قازی
دەگێڕێتەوە:

"ڕۆژێک لەگەڵ
ئۆسکارمان ومیرزائەسکەندەری
بەیت بێژ لەقەراخ چۆمی
مەهاباد دانیشتبووین و
میرزا ئەسکەندەر بەیتی
"لاس وخەزاڵ"ی دەگوت و
ئەویش بە ئەلف بێتکەی
لاتین دەی نووسیەوە. لەسە
نەکاو لە جێگەیەکی
بەسەرهاتی لاس و خەزاڵدا
کە دەگاتە دەربڕینی سۆزو
کوڵی لاس، ڕۆژهەڵاتناسی
ئەلمانی سوێندی خوارد کە
بابەتی ئاوا جوان و
دڵڕفێن لەئاسەواری هیچ
نووسەرێکی ڕۆژاوادا نەخوە
ڵقاوە و نیە!

بەڵێ، ئۆسکارمان پاش
فێربوونی زمانی کوردی بە
یارمەتی میرزا جەوادی
مامۆستای ومیرزائەسکەندەری
بەیت بێژ کەوتە کۆکردنەوەی
ئەو گەنجینە بێ وێنەیە
و پاشان ویستی بەرەوزێدی
خۆی بگەڕێتەوە. ئەوەندەی
میرزا جەواد خۆش دەویست
کە نەیتوانی بەجێی بێڵێ
تکای لێکرد لەگەڵی بڕواتە
ئەلمان ولە ڕێک وپێک کردنی
بەیتەکاندا بەزبانی لاتین

یارمەتی بدا و خوێندنیش درێژە پێ بدا. میرزا جەواد ئەو هەلەی لەدەست نەدا و لەگەڵ ئۆسکارمان رۆیشتە ئەلمان ورەخت و پەلاسی لە شاری برلین بە عەرزی دادا.

ئۆسکارمان بەیتەکانی بەیارمەتی میرزا جەواد لە چاپ دا وکورتەرێزمانێکیشی لەسەر زبانی کوردی لەگەڵ وەرگێڕاوی بەیتەکان بە ئەلمانی بلاو کردەوە.

من (محەممەدی قازی) ئەو کتێبەم بوو. بەیتەکانم بەلاتینی دەخوێندەوە بەلام چونکو ئەلمانیم نەدەزانی نەمتوانی لە وەرگێڕاوەکە و رێزمانەکەی کەلک وەرگرم.

میرزا جەواد هاوکات لەگەڵ یارمەتی دانی ئۆسکارمان فێری زمانی ئەلمانی بوو و رۆیشتە "زانکۆ" حقووق و خوێندنی خۆی تا وەرگرتنی دوکتۆرا درێژە پێدا.

سەفارەتخانەی ئێران لە ئەلمان ئەو پیاوە زانایەی قۆستەوە وبوو بە مونشی سەفارەتخانە.

پاش ماوەیەک میرزا جەواد ژنێکی ئەلمانی هێنا ئەو ژنە لە بنەماڵەیەکی گەورەی ئەلمانی بوو. باوکی یەکێک لە دەریادارانی گەورەی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو. بەلام ئەم تێکەلاوی یە بێ ئاکام مایەوە و منداڵیان نەبوو میرزا جەواد کەئێستا ببووە دوکتۆر جەواد، وردە وردە پلەوپایەی وەسەرکەوت و هەر لە ئەلمان مایەوە. لە ساڵی ۱۳۰۷ هەتاویدا داوەر وەزیری دادگوستەری ئەو سەردەمە کە دوکتۆر جەوادی باش دەناسی تکای لێکرد بگەڕێتەوە ئێران و لە دادگوستەریدا کار بکا بەمجۆرە دوکتور قازی گەڕاوە ئێران بەلام ژنەکەی لەگەڵی نەهات ولە ئەلمان مایەوە. لە تاران دوکتۆر قازی ژنێکی دیکەی هێنا کە ئەوجاریش نەبوو بە خاوەنی منداڵ بە وەجاخ کوێری مایەوە.

پاش ماوەیەک دوکتۆر قازی کە منداڵی نەبوو و میرزا عەبدولخالەقی براشی وەفاتی کردبوو وبیستبووی کوڕێکی چاردە پازدەساڵەی هەتیوی لەپاش بەجێ ماوە کەوتە سەر ئەو فکرە کە ئەو کوڕە بێنێتە لای خۆی و دەبەر خوێندنی بنێ. ئەو کوڕە ناوی محەممەد بوو. ئەویش کە باسی مامی خۆی بیستبوو چەند نامەیەکی بۆ نارد و تکای لێکرد بیباتە لای خۆی لە تاران. محەممەد ساڵی ۱۳۰۸ هاتە لای دوکتۆر جەوادی قازی و لە دەبیرستانی "دارالفنون" دا دەستی بە خوێندن کرد. محەممەد دەرس خوێنێکی زۆر قابیل بوو.

لە ساڵی ۱۳۱۵ دیپلۆمی ئەدەبی و لە ساڵی ۱۳۱۸، لیسانسی حقووقی وەرگرت محەممەدی قازی وەدوای کاری حقووقی نەکەوت ورووی لە ئەدەب کرد. ساڵی ۱۳۲۲ ژنی هێنا و لە مامی جیا بووە. ئەو محەممەدە هەر ئەوەیە کە ئەمڕۆ بەناوی "محەممەدیقازی" دەیناسین و یەکێک لە ناسراوترین و گەورەترین وەرگێڕەکانی ئێرانە و کەمتر کەسێک هەیە نەیناسێ.

دوکتۆرقازی ساڵی ۱۳۳۷ لە نەکاو نەخۆش کەوت. دوکتۆران لایان وابوو ئەپاندیسی هەیە. بەلام کاتێ جەراحی بۆیان دەرکەوت کە سەرەتانی هەیە

دوکتۆر قازی لەونەخۆشی یە هەڵنەستاوە و پاش چەند رۆژ وەفاتی کرد.

دوکتۆر قازی شارەزایی تەواوی بە چەند زبان (ئینگلیزی - فەرانسە ئەلمانی - عەرەبی - تورکی فارسی وکوردی) هەبوو. بێجگە لەو خزمەتەگرینگەی کە لە کۆکردنەوەی بەیتان دا بە زمانی کوردی کردووە هێندێکیش مەقالەونووسراوەی دیکە هەن کە زوربەیان بلاو نەکراونەوە.

**شنۆ**: کاک بەدرەدین محەممەد ئەمین سالّح ئیسقێلی :

زۆر سپاس دەکەین کە جەدوەلت بۆ ناردووین . بەداخەوە واژەی ناو جەدوەلەکەت لەگەل رێنووسی زمانی یەکگرتووی کوردی رێک ناکەوێ .بۆنموونە (آرارات) دەبێ ئاوا بنووسرێ(ئارارات) تکایە بە دەبەرچاوگرتنی ئەم رێنووسە جەدوەلی دیکەمان بۆ بنێرە .

**سەقز**: کاک زاهیدی کازمی :

نامەکەت باسێکی رۆشنبیری مێژوویی و چەند پارچە شیعری تێدا بوو. کە هەرچەند لەرادەی چاپکردن دانین بەلام زۆر جێگەی سپاسە کە بابەتی جۆرا وجۆرمان بۆ دەنێری. ئەوەش بزانە کە ناردنی بابەت هەرچی بێ و هەر چەشنێک بێ نابێتە هۆی گیروگرفتی ئێوەی بەرێز.

**کەرەج: سەرئاسیابی مەلارد** : کاکە عەلی زەحمەتکێش :

وەلامی پرسیارەکانت بەم جۆرەن :

١ـ هۆی دواکەوتنی گۆواری سروە دەست نەکەوتنی کاغەزە، کە خەبەرمان پێگەیوە ئەم کەمایەسی یە نەماوە و سروە زوو زوو بلاو دەبێتەوە .

٢ـ لەسەر داوای ئێوە و ویستی خۆمان لە هەموو مامۆستایانی ئایینی داوا دەکەین لە ژن بەژنەدا ژن مارە نەکەن .

٣ـ لە سروەدا کەم و زۆر باسی تاریخی کوردستان دەکەین و خودا یاربێ زۆرتریش پەرە بەو باسانە دەدەین .

٤ـ شیعری مامۆستا قانیع زۆر بەربلاوو ناسراون .ئەگەر شیعری جوانی ئەو پایەبەرزەت هەیە بۆمان بنێرە چاپی کەین .

٥ـ مامۆستا هەژار ئێستا لە کەرەج دەژی و خەریکی نووسین ولێکولێنەوە و کاری فەرهەنگی یە . لە سەردەمی پێکهاتنی کۆنگرەدا نەخۆش بوو و نەیتوانی بەشدار بێ .

**بۆکان :داشبەند**: کاک جەعفەری رووحی زادە :

نامە و نووسراوەکەتمان پێگەیشت . باسێکی تێدا بوو کە فێری مشک گرتنمان دەکا بەشێوەی نوێ، کاربەدەستانی سروە دەلێن ئێمەدا نەویلەمان دەمالێ دا نیە و مشکیش روومان تێ ناکەن ! زۆر، سپاست دەکەین . خاترەی خۆشمان بۆ بنێرە .

**ئەهواز**: جاویدی ئەمینی :

گۆواری سروە جارێ هەوالنێری وەرزیشی نیە و ئێوە دەکرێ ئاگاداری پێویست لە گۆوارە وەرزشی ـ یەکاندا بدۆزنەوە. ژماری دانیشتوانی ئازەربایجانی رۆژاوا ١/٨٧٩/٠٠٠ وژماری دانیشتوانی ئوستانی کوردستان ١/٢٠٠/٠٠٠ نەفەرە.

**ئازەرشار** : کاک خەلیلی ئەحمەدزادە :

ئێمەش سەد ئەوەندەی تۆ لە ژن بەژنە توورەین . زۆرمان لەسەر نووسیوە و دیسانیش بەگژی دا دەچینەوە. لامان وایە ئەم رەسمە بەرەو فەوتان ونەمان دەڕوا و ئێمەش دەبێ ئاهەنگی رۆیشتنی کرژتر بکەین .

**بۆکان** : کاک محەممەدی سولتان پوور :

دەستت خۆش بێ بۆجەدوەلی داتناوە. زۆرجوانە. کەلکی لێ وەردەگرین .تکایە ئی دیکەشمان بۆ بنێرە .

**شنۆ** : کاک رەحیمی خالیدی :

"سروە" پڕە لە باسی فەرهەنگی. نازانین مەبەستی

ئێوە لە "فەرهەنگی" چیە ؟
**سەقز** : کاک نەوید :
بێگومان شاعیر یا نووسەری کورد زۆرن کە بە فارسی دەنووسن و شیعر دەڵێن.ئێمە ڕێزیان بۆدا دەنێین و بە سەرمایەی مەعنەوی کوردیان دەزانین بەڵام ناتوانین شیعر و نووسراوەی فارسی ئەوان بخەینە ناو سروە چونکە بۆ فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی تەنیا سروەمان هەیە، بەڵام بۆ زمانی فارسی گۆوار و کتێب و ڕۆژنامە زۆرن .
**نەغەدە- کانی بلاغ.** کاک عەلی مەحموودی :
سەلاحەدین ئەیووبی فەرمانڕەوایی کرد و مێژووی کورد شانازی پێوە دەکا و بۆگەلی خۆشی زۆر تێکوشاوە. کوردی دوو لەهجەی هەرا و بنەڕەتی هەیە. کورمانجی سەروو و کورمانجی نێوەراست .
کورمانجی سەروو لەکوردستانی تورکیە وشیمالی کوردستانی ئێران وعێراق دا دەکار دەکرێ .کورمانجی نێوەراستیش لەناوەند و جەنووبی کوردستانی ئێران و عێراق کەلکی لێ وەردەگرن . دیارە لەهجەی کۆن و ئەسیلی وەک هەورامی ولەکی و... هەن . خوالێخوشبوو حەسەن زیرەک زۆری تەرانە هەن کە ئێمە ژماریان نازانین .
**پیرانشار** : کاک عەلی ئاغەندە :
نوسیوتە "قلم دردست من مانند آب است ـ خجالت میکشم خطم خراب است "
ڕاست دەکەی ، خەتت زۆر ناخۆشە ، بەڵام لەلای مامۆستایەک مەشقی خەت بکەی خەتت خۆش دەبێ و ئێمەش بەجوانی نامەکانت دەتوانین بخوێنینەوە .
**شنۆ** : کاک جەعفەری جاویدفەر :
ئەگەر هێندێ جار جێگەیەک لە نووسراوەیەک لەژێر چاپدا خراپ دەبێ و ناخوێندرێتەوە بۆ ئێمە وەک کوێرووە لەگەنمی دابین وایە. بەڵام جاروبار شتی وا هەر دەبێ بەتایبەتی ئێمە لێرە و چاپ لە تارانێ !
ژمارە دە تایبەتی ساڵهاتی مەرگی مامۆستا هێمن بوو بۆیە تەنزی تێدا نەبوو. تەنز ودیاری یەکانت ڕەنگە زۆر لەمێژ بێ ناردبێ و بایەگانی کرابێ. هەوڵ دەدەین بیان دۆزینەوەوئەگەر بۆ چاپ ببن کەلکیان لێ وەرگرین .
**گوندی سونجاغ**: کاک عوسمانی عەزیزی :
هەروەک نووسیوتە هەڵەیەک لە فێهرستی ژمارە دەدا هەیە لێمان ببوورە. ئێمە بۆ موناجات هەر لاپەڕەیەکمان تەرخان کردووە، بۆیە موناجاتی مەولانا خالید ناتەواوە وجێگەی نەبۆتەوە . تکایە وەختی کڕینی گۆوار هەموو لاپەرەکان چاو لێکە با وەک ئەوجار گۆواری ناتەواوت بەر نەکەوێ .

نامە و دیاری ئەم ئازیزانەشمان پێ گەیشتووە
ئەهواز :
**عەلی مەحموودی ـ جاوید ئەمینی .**
ئازەرشار :
**خەلیل ئەحمەدزادە**
بۆکان :
**جەعفەر مەعرووف رووحی زادە ـ محەممەدسولەیمانپوور**
پیرانشار :
**سەلاحەدین خەلیلی**
سەقز :
**زاهید کازمی ـ عەزیز نەوید**
کەرەج :
**عەلی زەحمەتکێش**
شنۆ :
**ڕەحیم خالیدی**
مەهاباد :
**جەعفەر خۆشڕوویی**
نەغەدە :گەرگوولی خواروو :
**عەلی عومەری**
**بەدرەدین ئیسقێلی ـ محەممەد ئەحمەدی**

پاش بڵاوبوونەوەی چەند وتار لەسەر راو لە ژمارەکانی سروەدا بەپێویستم زانی راوچی یەکی کارامە پەیدا بکەم وبیناسێنم تا راو و راوچی وێکڕا بناسرێن چون وەختێک زانیمان راوە کەو چۆنە و کەروێشک چۆن راو دەکرێ وا باشە ئەوەش بزانین کە راوچی ئەوانە کێ یە یاخۆ چەند جۆرە راومان هەیەوراوچی بە کێ دەڵێن .

هەر بۆیە منیش بوومە راوچی راوچی ووەدووی پێ و شوێنی کەوتم. زۆرم، پرسیار کردن تا ئەوەی لێی دەگەڕام دیتمەوە.

خەڵکی شاری **شنۆیە** .ناوی **مستەفا** وشۆرەتی **مەحموود زادەیە**. کۆنە راوچی یە و لە زۆر شتان دەزانێ . وەختێک لەبارەی راوپرسیارم لێکرد گوتی :

**بنەماڵەی ئێمە زۆر دڵبەندی راو بوون منیش بوومە هۆگر و عیشقم کەوتە سەری . ئەگەرچی هەموو شیروتیرم قۆچەقانی یەک بوو بەڵام دوایە توانیم تفەنگ لەشان بکەم و بە تەنیایی بچمە راو.**

راو هانەیەکی تایبەتی هەیە و ئەنگیزەی راوچی لە راو بەپێی هەل ومەرج و وەزعی ژیان و جێگەی بنەگرتنی ئەو جیاوازی هەیە و نیەتی راوچی فەرق دەکا ویستم بزانم کاک مستەفا بۆ چ مەبەستێک دەچێتە راو.

**کوردستان هەریمێکی شاخاوی وبەرزە ولە چڕ و رەوەز ودارستان و لێڕ پێک هاتووە وراو یەکێکە** لە تایبەتی یەکانی ناوچەی کوردستان .راوچی کەدەچێتە راو نەزەری لەگەڵ ئەویدی جیاوازە. یەک تەنیا بە مەبەستی کوشتن دەچێتە راو. یەک بۆ گۆشت راو دەکا . یەک بۆکەڵک وەرگرتن و بەهرەوەربوون لە ئاو و هەوا وتەبیعەت دەچێتە راو. من بۆخۆم هەم بۆ وەرزیش وکەڵک وەرگرتن لە ئاو و هەوای تەبیعەت دەچم و لە پەنای وانەش لە راو کە نیعمەتیکی خوا داوە بەهرەمەند بم.

ئەڵبەت بەئوسوولێکی راست و بەجێ نەک بەشێوەیەک بێ کە باری وەرزش و راو لەنێو ببا. راو بەر لە هەموو شت شۆروشۆقەکەی خۆشە. راوچی شۆروهەیەجانێکی

تایبەتی هەیە کە سەرما و گەرما و ناڕەحەتی و کەم بوون و نەبوونە قەبووڵ دەکا دەنا ئەگەر بە زەبر وزۆری بێ سەعاتێکیش خۆی پێ ڕاناگیرێ .

وادیار بوو باسی ئینسانی ترین مەبەستی ڕاوی ڕاگەیاندووه بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کەخۆی چ لە نێچیرەکانی دەکا . هێندەی پێ نەچوو وەک چاوەڕوانی ئەم پرسیارە بوو بێ گوتی:

ئەگەر تائێستا چوومە ڕاو ، نێچیرەکەم لەنێوان دۆست وبرادەران بەشیوەتەوه و پێستەکەشم هەر بەدیاری ناردووه یامێوان هاتووه و

لەگەڵ خۆی بردوویەتی . تەنیا وێنەکەیان لەلای من ماوەتەوه .

دەی جا ئەگەر وایە بۆ ڕاو دەکەی ؟

گۆشت نێعمەتێکی خوا داوه وەک نێعمەتەکانی دیکە وەک گەنم! ئەگەر بەجێ کەڵکی لێ وەر نەگری دەفەوتێ. بڕوانە لە گەنم ئەگەر وەختی خۆی نەدروێتەوه ورەعەمەل نەیە دەپەڕێ وبۆ کەڵک وەرگرتن نابێ. ئەڵبەت هەر ئەو نێعمەتە ئەگەر بەشێوەیەکی خراپ کەڵکی لێ وەربگیرێ نابێ .

یانی چی؟ بە شێوەی خراپ کەڵکی لێ وەربگیرێ چ مانایەکی هەیە؟ بۆ من پرسیار ئەوه بوو کە چ دەبێ ئەگەر هەموو کەس گۆشت نێچیر بخوا ؟ یا لەم نێعمەتەی خوا هەموو بەشدار بن ؟ باسەکەم دیسان هێناوه گۆڕ تاپتر شی بێتەوه .

"مەبەست لە کەڵک وەرگرتنی هەڵە ئەوەیە کە ڕاوچی چون لەگەڵ تەبیعەت و نێچیر و ڕاو بەرەو ڕووه دەبێ سیفاتی جوامێرانەی ببێ یانی وەختی وا نەچێتە ڕاو کە نێچیر بێچووی لەبەر بێ چون ئەو دایکە ساڵێکی دیکە بۆخۆی چەند بێچووی دەبێ و هەریەکە بۆخۆی دەبێتە نێچیرێکی تازە بەڵام ئەگەر وا نەکا نەسل و تۆرەی ئەو گیاندارە لەنێو دەچێ و ئەم نێعمەتە هەر بۆ ئێمە نیە و داهاتووش بەشیان پێوەیە. ئەو دەم بەشی ئەوان نامێنێ .

– نەخشی ئیدارەی موحیتی زیست لەم نێوەدا چیە ؟

لە یەکەم پلەدا ویژدانی ئینسان مەترەحە ڕاو وشکار شتێک نیە دەستی بەسەردا بگیرێ.هیچ کەس ناتوانێ ڕاوچی کونترۆڵ بکا بەڵام وەکی گوتم:" مەبەست ئەوەیە کە ڕاوچی بۆ دەچێتە ڕاو . ئەگەر مەبەستی زۆرکوشتن بێ هەڵەیە و بە قەولی فارسان پیاو بۆ گەشت "گشتن" بچێ نەک بۆ "کشتن" (کوشت) . موحیتی زیست ئینسانی شارەزای لێیە و ڕێنوێنی ڕاوچین گۆوارەکانیشیان زۆر بە کەڵک بوون و من تا ڕادەیەکی زۆر کەڵکم لێ وەرگرتووه .

باس لە ڕاو کرا و دەبوو بپرسم ڕاوچی بەتەواو مانا چ تایبەتی یەکی هەیە پرسیم لەوەڵامدا گوتی :

– ڕوانینی ڕاوچی لە هەر شوێن و مەڵبەندێک

بەپێی هەل ومەرجی ژیان جیاوازە.

ئێمە بۆ وەرزش و هەڵمژینی هەوای فێنکی کوێستان و خواردنەوەی ئاوی تەبیعەت دەچینە راو ئەگەر نێچیریشمان نەکوشت زۆر بەلامانەوە گرینگ نیە و نارەحەت نابین.

بەپێی ئەو مەبەستە راوچی نیە. خۆ نابێ هەر چی وەبەرچاو هات بیکوژی.

چەکی قەدیم زۆری پێ نەدەکوژرا. وەسیلەی هات و چۆ وەک ئێستا نەبوو ئێستا رێگای ماشین و هات و چۆ خۆش بووە و خەڵک بۆ راو کەمتر لە ئەسپ کەڵک وەردەگرن.

لە لایەکی دیکەوە راوچی یەکی کارامە ناوبانگت دەرکردووە.

ـ ئەڵبەت ئەوە لوتفی دۆستانە ودەنا من وەکی تۆ دەفەرمووی وانیم. بەڵام بەگشتی یەکەم هۆی مەهارەتی راوچی عەلاقەیە. ئەگەر دڵبەندی و عەلاقە نەبێ کەس ناتوانێ ئەم مەودا دوور ودرێژە ببڕێ

..ئەگەر کەوێکم کوشت کەوی دووەمیش هەر ئەوە...

و سەرما لە قەبرغەی بدا و گەرما دایهێزێنێ. لە لایەکی دیکەشەوە لێهاتوویی راوچی بەستە بە مرخ و ئیستعدادی ئەوە. راوچی دەبێ بەسەر کەندوکۆسپەکانی رێگایدا زاڵ بێ. دەبینی چویە راو. حەوتوویەک دەخولێیەوە هیچت وەگیر نەکەوتووە بەڵام لە پڕ تووشی نێچیر دەبی. یا بە سەریدا دەکەوی. نابێ دەستت بلەرزێ، نابێ بشەمزێی.

هۆیەکی دیکەی لێهاتوویی راوچی ئیمکاناتە ئەگەر راوچی یەکی باش عەلاقەی بە راو بێ و ئیستعدادیشی زۆر بێ بەڵام

تۆرەی بەعزە نێچیرێک لە وڵات براوە. وەک بەران. مەگەر چلۆنکایی لە قۆرغ ( وەک مەڕەکانی وەدەست بکەوێ) جێگای ژیان بۆ نێچیر نەماوە. هەموو جێگایەک لێکدراوە، دەبێ لێرەدا ئیدارەی "موحیتی زیست" ئەرکی خۆی بنوێنێ و ئەم کارە گرینگە وەستۆ بگرێ وراوچیش یارمەتی بدەن.

ـ چۆنە تۆ بە ناوی

کە کەرەسەی راو لە ساڵان پترە و ئیمکانات زۆرترە و چەک زۆرتر لەبەر دەستی خەڵکە وەزعی راوی کوردستان لەم هەل ومەرجەدا چۆن دەبینی ؟

من وەک راوچی کە دەچمە راو دەبێ ئەوە بزانم کە ئەگەر کەوێکم کوشت کەوی دووەمیش هەر ئەو کەوەیەوهیچ فەرقی نیە. ئەوەی بەو مەبەستە راو دەکا دەتوانم بڵێم

ئیمکاناتی نەبێ ناتوانێ راوچی بێ. یا بەپێچەوانە ئیمکاناتی هەبێ وئیستعدادی راویشی هەبێ بەڵام دڵبەندی بە راو نەبێ ناتوانێ ببێ بە راوچی

ئەوجار دەبێ راوچی فەسڵی راو بناسێ ، هەر فەسڵەی وەختی راوێ شتێکە و هەموو ئەوانە جیاوازی - یان هەیە کەخوا یار بێ و مەرگ مەودا بدا وردە، وردە باسیان لێدەکەین

دەبینین بۆ وێنە راوی کەروێشک پایزە و بەران زستانە هۆی چیە ؟

ئەوە دەگەڕێتەوە سەر باسی جانەوەرشناسی. بەران سەرەتای زستان دەپەڕێ . بیست رۆژ پێش ئەو وەختە و بیست رۆژ پاشان وەختی راویەتی (ئەڵبەت بە

ناوچە دەگۆڕێ) .

راوی کەو بەرە بەری خەرمانانە چون ئەو دەم فەرخەی پەرەوازە بووە. مراوی لەگەڵ کەو فەرقی هەیە. رەنگە نێچیرێک مانگی رەزبەر لە ( ئازەربایجانی رۆژئاوا ) راو بکرێ بەڵام لە خووزستان وەختی راوی نیوەی زستان بێ .

هێندێک کەس راوی گیانداری کێوی دەکەن وەک گورگ و ورچ و ...کەهیچ قازانجێکیان نیە. لەوبارەوە دەڵێی چی ؟

- لەنەزەر جانەوەرشناسی - یەوە راوی ورچ مەنع نەکراوە.بەڵام گورگ مەنعە رەنگە ئینسان بڵێ ئاخر مەڕی دەخوا . یا رێوی کە حەیوانێکی تووش وبە زەرە و مریشک و... دەخوا بۆ نابێ راو بکرێ ؟

لە وەڵامدا دەڵێین هەر ئەو رێوی یە جرجە مشک دەخوا کە گەورەترین ملۆزمی زەوی وکشت و کاڵە.

هەڵبەت لەهەموو حاڵدا ئەگەر زەرندەیەک هێرشی بۆ هێنای دەتوانی بیکوژی.

ئەوەی چەند ساڵ راوی کردووە جێی بەران و نێری پێدەزانێ. یا هیچ نەبێ ئەو جێگایانەی کەوی یان لێ بووەوئێستا بەتاڵاون دەناسێ. وەختێک لەم بارەوە پرسیارم لێکرد گوتی :

- چەند ساڵ لەمەوبەر کێوەکانی دەوران پشتی شنۆ نێچیری زۆر بوو،بەڵام ئێستا هەموو فەوتاون.

گەڵی قاسملی بەرلەوە کە رێگەی ماشێنی پێدابکێشن پڕ بوو لە بزنە کێوی بەڵام ئێستا نەماوە

وەختێک دەچووینە ماکۆ بە دە شەو بنەگر دەبووین یانی ساڵەکانی ٢٣ و ٢٤، نزیک شازدە ساڵمان راو لێکرد لەقۆرغی مەڕەکان .

ببوورە مەڕەکان کوێ یە؟

لەنێوان مەرەند و قەرەزیادینی خۆیە بۆ لای ئاراز . راوگەیەکی چاک بوو. ئەودەم کەم کەس بۆ راو خۆی لێدەدا بەڵام دوایە وای لێهات کەچی وای تێدا نەمابوو. پاشان پاوان کرا وئێستا قۆرغ کراوە و نایەڵن کەسی بچێتێ.

دیسان قەدیم لە خۆی و سەقز وبیجار و هەوشار و جولفا راو هەبوو بەڵام ئێستا راوی لێ نەماوە .

# ئاگری

# فۆلکلۆر

– دەمالا باڤێ دێ
وخووشکا بشەوتە ،
برا بێنە بەرسەرێ
لاوێ عەشیرێ روونێن ،
ژێرا بێژن قایدەکێ
ڤێ حافزییێ،...
– بلا دەسمالا هلدن ،
خوونا سۆر تەمز کن ،
پێش عەنییێ،...
بێ وایێ ل من ،
وایێ ل من،...
گوللان و باارووتێ
ڤی کافری ، سەر
لاوێ عەشیرێدا تێنە
فەنانی کایێ،...
– خودێ ومێردزانە ،
ئیسال چەند سالە
لاوێ عەشیرەتێ ،
پێشیا دەولەتا تورکا
ئاسێ بوونە، ژێرا
نایێن رایێ،...
– بێ لۆلۆ، وەی لۆلۆ
بێ لێ دایێ، رەبەنێ
شەڕەکێ ل مە قەومی
بەرەکا گریداغێ،
ل همبەرە،...
– قالەکێ ل مە قەومی
بەرەکا گریداغێ ،
ل همبەرە،....
– دوهەزار و هەفسد
ئەسکەرێ ڤی جان تورکی
کشیانە ل سەر
لاوێ عەشیرێ
ب تۆپ وب قۆمپەرە،....
– شێخ زاهر ئەفەندی
ب سێ دەنگا کرە گازی
گۆ:

ڤێ بەلەکییێ،...
– شێخ زاهر ئەفەندی
ب سێ دەنگا
کرە گازی ،
– گۆ:
–" وەئۆجاخی
خراڤ بە ،
چاوا کەسەکێ تونە ،
جاڤەکێ بدەئێلا ژێرین
برا بێنە کۆمەک و
ڤێ هەوارییێ،....

بێ لۆلۆ، وەی لۆلۆ....
بێ دەدایێ رەبەنێ ،
شەڕەکێ ل مە قەومی
بەرەکا گریداغێ ،
ل قۆنتارا چییێ ،...
– قالەکێ ل مەقەومی
بەرەکا گریداغێ ،
ل قۆنتاری چییێ،...
– دەنگێ تۆپان و
تەیاران تێیۆ
ل فێزامە و تەپا

گومانا مه ژۆرمایه‌خودێ،
ئێرمایه حه‌زره‌تێ عه‌لی-
سیارێ دولدلێ،
زاڤانگێ پێغه‌مبه‌ره،...
- بێ لۆلۆ، وه‌ی لۆلۆ..
بێ دایێ ،دێرانێ،
شه‌ره‌کێ ل مه قه‌ومی
به‌ره‌کا گریداغێ،
ل ده‌ڤی پرێ،....
- قاله‌کێ ل مه قه‌ومی
به‌ره‌کا گریداغێ،
ل ده‌ڤی پرێ،....
ئه‌زێ بالا خو دده‌مێ
ل ئوستییێ لاوێ
عه‌شیرێ دا ماکینه‌نه ،
دده‌ستادا تاماتێکێ
دۆر بگرێ،....
- خودێ و مێردزانه،
ئیسال چه‌ندساله
لاوێ عه‌شیره‌تێ
به‌رێ ده‌وله‌تا تورکا
ڤه‌رگه‌راندنه سه‌ر قه‌زا
ڤێ ئیدرێ،....
- بێ وایێ ل من ،
وایێ ل من وایێ....
شه‌ره‌کێ ل مه قه‌ومی
به‌ره‌کا گریداغێ
ڤێ ئادریسێ،...
دوهه‌زار و هه‌فسد
ئه‌سکه‌رێ ڤی کافری
برییه پێشیا
خۆرتی عه‌شیرێ
لێ بوویه ئاسێ،...
- شێخ زاهر ئه‌فه‌ندی
ب سێ ده‌نگا کره گازی،
گۆ:
" بلا بشه‌وته مالا باڤێ
دێ و خووشکا ،
بلا بێنه مه‌یتێ
لاوێ عه‌شیرێ
بکشینن "پادڤالێ" ،
ڤێ "بالنیسێ"
بێ وایێ،
ل من وایێ،....
گوللان و باڕووتێ
ڤی کافری ،سه‌ر
لاوێ عه‌شیرێدا تێنه
فه‌نانی کایێ،...
خودێ و مێر دزانه
ئیسال چه‌ندساله
لاوێ عه‌شیره‌تێ
پێشیا ده‌وله‌تا تورکا
ئاسێ بوونه، وێ
ژێرا نایێنه رایێ،...
تۆپ و پۆلیمێتێ
کافرێ که‌مال گرانن،
کۆکۆ خوه‌دانه ده‌ڤێ
ها به‌له‌کییێ،....
- فه‌رزه‌نده کره گازی
گۆ:
عه‌ڤدوره‌حمانۆ
باڤێ منۆ
چێ به، چێ بخه‌بته،
ده‌چاوا که‌سه‌ک تونه
جاڤه‌کێ گه‌لییێ زیلا،
ته‌ختێ پایێ، ژ
قولیخانێ لاوێ حه‌سۆ
رابه وبێژێ :
چۆروچۆجخێ کورمانجا
ل چیایێ گریداغێ
ل ده‌ستێ رۆما رووتکدا
چاوا که‌تنه هازه‌لوولییێ،.
ده‌لێخن ، باڤێ منۆ
هاب کێف لێخن ،
پشتێ ژ رۆما رووتک
بستینن، ره‌ڤێ پێخن،....
ده‌ئیرۆ ل مه‌یدانێ
شه‌ڕ خۆشکرنه:
فه‌رزه‌نده و عه‌ڤدوره‌حمان
ژ خودێڤا عه‌یانه
هه‌ردوو په‌یایێ،
مالا شێخن ،...
- شه‌ڕه‌کێ ل مه قه‌ومی
گریداغا شه‌وتی
وێ ل نکه،...
تۆپ و پۆلیمێتێ
کافرێ که‌مال گرانن،
ڤێ سوبه‌نگێ سه‌ر
هێسیرێ مه‌دا
تکه‌تکه،...
فه‌رزه‌نده کره گازی
گۆ:
گه‌لی خۆرتا چێ بن
چێ بخه‌بتن،
ئیرۆ ل مه‌یدانێ
هاتییه کوشتن
عه‌ڤدوره‌حمانێ برا
ژ خودێڤا عه‌یانه
شێرێ منی چارگورچکه،...
ده‌لێخن، باڤێ منۆ
ها ب کێف لێخن ،....
پشتێ ژ رۆما رووتک
بستینن
ها ره‌ڤێ پێخن،...
ده‌ئیرۆ ل مه‌یدانێ
شه‌ڕ خۆ شکرنه
فه‌رزه‌نده وعه‌ڤدوره‌حمان
ژ خودێڤا عه‌یانه
هه‌ردوو په‌یایێ
مالا شێخن،....

* * * *

## تاریخی

# تاقی بستان

1

**ئەحمەد شەریفی**

شوینەواری میژوویی **تاقی بستان** کە نیشاندەری پیشکەوت وگەشەی هونەری ئیرانی زەمانی ساسانی یانە هەر لەبەر ئەوە گرینگ نیە کە وینەی چەند شا و شازادەیان پیوەیە، بەلکوو ئەم شوینەوارە میژوویی یانە نیشاندەری هونەروپیشکەوتی هونەری ئەو سەردەمەن وداب و رەسم ونەرینی ئایینی ئەو عەسرە وەدیار دەخەن. ئەوە روون دەکەنەوە کە کووتال تەنین چەند پیشکەوتوو بووە و موسیقا و کەرەسەی موسیقاژەنین چ بوون وچون بوون. هونەرە جوانەکانی وەک وینەگەری و کەندەکاری تا چ رادەیەک برەویان بووە و شیوە و بیچمی راو و شکاری ئەو سەردەمەیان بەرچاو خستووە. ئەو ئاژەلانەی ئەودەم لە خزمەتی مروف دابوون وئەو چەشنە بالندانەی رایگرتوون وئەو جورە گول وشیناوەردەی لە پارک و پاراداسیەکانی ئەو سەردەمەدا بوون و ئەم چەکەی کەلکیان لی وەرگرتووە یا ئەسپ و زین ونیزە وشمشیر وگەمی و لوتکە وجل وبەرگی ژن و پیاو وسازوبەرگی شەر و.......

کاتیک بەوردی سەرنج دەدەینە شوینەوارە میژوویی یەکانی تاقی بستان بەتایبەتی راوگەی خوسرەو پەرویز وەلامی ئەم پرسیارانەمان بودەدوزریەوە و گرینگەتی وبایەخی ئەم چەشنە کەتیبە ووینانەمان بو دەردەکەوی.

لە لایەکی دیکەوە ئەم چەشنە ئاسەوارە بەشیک لە فەرهەنگ و کولتووری رابردووی ئیرانن و بە توژینەوە لەگەل میژووی

کونی ولات وباس وروداوی قەوماوی نیشتمانەکەمان ئاشنا دەبین .زولمو زوری شایانمان بو دەردەکەوی و خەباتی کومەلانی خەلک دژی زورداری وچەوسانەوەمان پیشان دەدا

راستە زوربەی ئەمچەشنە شوینەوارە میژوویی یانە پاشماوەی شایەکانن بەلام سەرەرای ئەوەش نوینەری زور بارودوخی کومەلایەتی و ژیانی خەلک ،بارودوخی فەرهەنگی ،شیوەی خەت و پیت وزمان ،چەشنی جل و بەرگی چین وتویژی جوراو، جوری کومەل، نیشان دەدەن و لەزور بار وبابەتەوە دەبنە مەشخەلی دوزینەوەی ریگای راست وروون کردنەوەی گوشە جوربەجورەکانی میژوو

ئیمە بەوردی دەروانینە شوینەوارەکانی میژوویی و تیدەکوشین لە بەرگری چراوان لاپەرەی تاریکی میژوو روون بکەینەوە.

**تاق بستان ، تاق بوستان ، تاق وەستان، تاق وەستام یا تاق باستان** ناوی سەیرانگەیەکی خوش ئاو و هەواو شوینەواریکی میژوو-یی یە، کە لە جەنووبی شاری کرماشان هەلکەوتووە. ئەم هەریمە هەر لەدەوری ساسانی یەوە هەتا ئیستا سەیرانگەی خەلکی ئەم ناوچەیە وشا ساسانی یەکان بووە

تاقی وەستان لەداوینی چیای سەرکەشی **پەراو** (بەشیکە لە زەنجیرە چیای شاهو) هەلکەوتووە. تا حەفتا هەشتا سال لەمەوپیش لە دوز شانی تاقی وەستان لەسەر دوو کانی یەکە، دوو کوشکی چەند نهومی خوسرەو پەرویز مابوو بەلام ئیستا هەر شوینەواری ماوەوبەس. شەش سەرکولەکە و ستوونی بەردینەی هەیە کە سییان بە گول ووینە رازاونەوە ئاناهیتا "خیوی ئاو" یان لەسەر نەخشەکە ئەوابا سیان دەکەین .

**سەرستوونی یەکەم**

ئەم سەرستوونە ۹۱/۷ ، سانتیمترە. لەسەرەوە چوار گوشەیەکی (۹۰×۹۰)دە و لە ژیرەوە دایرەیەوقوترەکەی ۵۷ سانتیمترە. دەوری بە گول رازاوەتەوە،لەلایەکی وینەی خوسرەوپەرویز هەلکەندراوە. شا جل و بەرگی شایەتی لەبەردا ، شمشیریکی لە نیو قەد بەستووە. دەستی چەپی لە سەر قەبزەی شیرەکە داناوە و دەستی راستی بووەرگرتنی فەرەهی ئیزەدی کەنیشانەی شایەتی بووە بو لای ئاناهیتا راداشتووە .

خوسرەوپەرویز تاجی کونگرەداری لەسەرە. دوو رشتە مرواری بەدەورە پیدا هاتوتە خوار. لە پیش کونگرەی تاجەکەوە خەرمانەی مانگ دیارە ولە سەرووی تاجەکە خورومانگ کیشراوە. لە هەر دوولای خەرمانەی مانگەوە دوو شابالی هەلو دیارن کە نیشانەی ئالای ساسانی یە.

شیری قەدی خوسرەوپەرویز مرواری نیشانە وتەنانەت چەند ملوانکەی دوروجەواهیر و بەردی بەنرخیش لەملی شا دایە. تەواوی جل و بەرگی بە جەواهیرات رازاوەتەوە .

لە لایەکی دیکەی ئەم سەرستوونە وینەی ئاناهیتا کیشراوەتەوە کە لیباسیکی

رازاوەی چین چینی لەبەر دایە کە لە کراسی ژنە کوردی ئیستای ناوچەی سنە و سولەیمانی دەچی.

کولوانیکی ئەستیرەنیشانی بەشانی داداوە هەتا سەر قولی داپوشیوە .ئەم کولوانە لە کولوانەی ئیستای ژنە کوردی ئیلام وقەسری شیرین دەچی .وەک وان لە پیشەوە لەسەر سینگی گریی داوە

پروفسور هەرتسفیلد ی روژهەلاتناس پیی وایە "ئەم شیوە لیباس پوشینەی ئاناهیتا لە شیوەی جل و بەرگی ژنی یونان دەچی بەلام کراسی ئاناهیتا بەراستی کراسی کوردی ئیستای ژنە سنەیی و سلیمانی یە وکولوانەکەشی هەر کولوانەی ژنە قەسری و ئیلامی یە .

ئاناهیتا تاجیکی بچکولانەی لەسەرە کە بە نەخشی خور رازاوەتەوە. لە ژیر تاجەکەوە قژ وپرچی بە کەزیەی دیارە کە هاویشتوویەتە سەر شان و مل وسینگ ومەمکی.جووتیک گوارەی زلی لە گویدایە. فەرەهی ئیزەدی بەدەستی راستەوە دەستی چەپی هاویشتوتە سەر سینگی و وا ویدەچی شتیکی بەدەستەوە بی بەلام لەبان سەری خەرمانەی نوور دەبیندری،

لە لانی چەپەوە گولیک نەخشە کەپیموایە پنجی گول وگیای پیروزی هوومە.

**سەرستوونی ژمارە دوو**

ئەم سەرستوونە لەشکل و روالەتدا هەر لەستوونی ژمارە یەک دەچی بەلام نەوەد سانت بەرزە. دوولای بە گول و پنجە گول رازاوەتەوە .دوولاکەی دیکەشی وینەی خوسرەوشەرویز و ئاناهیتای لی هەلکەندراوە. گولی دوولای ستوون وینەی ئەم گولانەیە کە لەملا و ئەولای هودەکەی تاقی وەستان هەلکەندراوە. گەلای پان وپورن .لەگەلای کەنگر و دارە بەن دەچن لەوانەیە پنجیکی زلی گیای پیروزی هووم بی. دەوراندەوری ئەم سەرکولەکە گولە لاو لاوە کە نیوە نیوەی عەلامەتی دلی تیدایە

**سەرستوونی ژمارە سی**

ئەم ستوونەش وەک ئەوانی دیکەیە بەلام لەودا وینەی ئاناهیتا و خوسرەو پەرویز گەورەترن وباشتریش ماون ودەستە چەپی ئاناهیتا بەجوانی دیارە کە پنجە گولیکی بەدەستەوە

دوولای ستوونەکەش بە گولی پر لک رازاوەتەوە کە لە گولدانیکی بچووک دایە .ئەم گولانە دوولای ستوونەکەیان داپوشیوە ودوو لاکەی دیکەشی خوسرەوپەرویز و ئاناهیتان . پیموایە ئەم شەش کولەکە ، سەر ستوونی کوشکی سەرکانیاوی تاقی وەستانە کە بەرە بەری ٦٣٨- ٥٩٠ ی میلادی ساز کراون .

حەوشە گەورەی تاقی وەستان سی بەردە قەبری سەردەمی ئیسلامی لییە، کە

ئایەتی قورئانی پیروزیان بە خەتی کووفی لەسەر هەلکەندراوە .لەسەر یەکیان بە خەتیکی خوش نووسراوە : **لاالەالاالله** کە دیارە لە قەبرستانەکانی دەوروبەرەوە بو ئەم هەریمە راگویزراوە

لەسەر لیوی حەوزە گەورەکەی تاقی وەستان نیوەکوتەلیکی لییە کە دیارە لەجیگەیەکی دیکەوە هاتووە. هەموو سەروچاوی شکاوە. هەر ئەوەندە دیارە کە ئینسانە. دەستە چەپی لەسەر سینگی داناوە ، و دەستە راستی بە گویی شمشیریکی گەورە گرتووە کە لەنیوقەدی بەستووە ، بە شیوەیەک کە شیرەکە لەسەر نیوکی راوەستاوە.

لەپال کیوەکەدا ، لە نزیک کانی یەکە. بە لای راستەوە وینەی ئەردەشیری دووەم شای ساسانی لە نیوان ئەهورامەزدا ومیترا دا هەلکەندراوە. ئەهوورا مەزدا لەلای راست راوەستاوە دەستی راستی لە کەلەکەی ناوە وبە دەستی چەپی فەرەی ئیزەدی نیشانەی شایەتی دەدا بەئەردەشیر.

میترا لەشانی چەپەوە

میترا لەشانی چەپەیەوە ویستاوە. شتیکی شمشیر ئاسایی بە دوو دەست لە پشت سەری ئەردەشیر راگرتووە. خەرمانەیەکی نووری پرشنگداری خور پشت سەری داگرتووە، لە ژیر پییەوە گولیکی وەک گولە بەروژە نەخشاوە. لەژیر

پیی ئەهوورا وئەردەشیریش پیاویک دەستی وەژیر سەری ناوە وراکشاوە. ئەهوورا مەزدا لەبان سەری و ئەردەشیر لەپیسەری ئەم پیاوە راوەستاون .

روون نیە کە ئەوە کییە کەوا پی شیلی ئەهوورا و میترا و ئەردەشیر بووە بەلام وا ویدەچی کەسیکی گەورە لەولاتی روم یا یونان بی. چون ردینی زور لە رومیان دەچی وتاجەکەشی بە خشل و گەواهیرا رازاوەتەوە وملوانکەیەکی بەردینەی بەنرخی لەملدایە.

ئەردەشیر بە دەستە چەپی تاجی شاهی لەئەهوورا مەزدا وەردەگری . دەستی راستیشی لەسەر گویی شمشیرەکە راگرتووە وتاجی شایەتی لەسەرە. بەشیکی سەروچاوی شکاوە.ئەم کەندە کاری یە دەبی لە سالەکانی ٣٨٣- ٣٧٩ ی میلادی لە

دەورەی حوکماتی ئەردەشیردا هەلکەندرابی .

# هونەر و هونەرمەندانی کوردستان

## کەماڵ تاتایی

ـ تکایە خۆت بناسێنە .

ـ من کەماڵ تاتایی خەڵکی سەقز ،ساڵی ١٣٣٣ لە بنەماڵەیەکی فەقیر لەشاری سەقز لەدایک بووم . پێش ئەوەی بچمە مەدرەسە عەلاقەم بە نەققاشی بوو . وەختی دەرس خوێندنم رەنگ رەوغەن لەسەقز نەبوو هەر بە میداد خەریکی نەققاشی بووم ، ئەگەر چی ئیمکانات نەبوو بەڵام ئەم غەریزە لەوجوودمدا ، هەبوو . منیش هەر بە میداد خەریک بووم وئەو شتەی لە مەغزم دابوو دەمکێشاوە هەر بەم چەشنە رۆژگارم رادەبوارد تا چوومە دەبیرستان . لە دەبیرستان لەگەڵ نەققاشی جۆراوجۆر ئاشنا بووم ،تابلۆی رەنگ رەوغەن و ... بەڵام ئەگەر ئیمکانم بوایە دەمتوانی هەستی خۆم رەزا بکەم بەڵام داخەکەم نەگونجا وهەر بە میداد درێژەمدا .

ساڵی ٥٤ دیپلۆمم وەرگرت لەئیدارەی ئامووزش وپروەرش ، دامەزرام . ئەووەختە حقووقم وەرگرت وتوانیم کەرەسەی وێنەگەرێ بکڕم .لەووەختەوە من خەریکی نەققاشی رەنگ رەوغەنم و هەروا درێژەمداوە تا ئێستا

س ـ لە چ سەبکێک دا کار دەکەی ؟

ج ـ وەڵڵاهی بەوسوورەتە بەقەولی فەیزوڵڵاخانی نا هید کە لە سروەی ژمارە ٢ دا وتووێژی لەگەڵ کرابوو سەبک بەم جۆرە ناناسم بەڵام ئەوانەی کە خاوەن ران تابلۆ ـ کانی من بەسەبکی واریسە دەناسن . ئەڵبەتە تابلۆکانی من تا ئێستا زۆرترلە رووی مودێلەوە بووە چون من بە هۆی فەقری ماڵی نەمتوانیوە کەرەسە بۆخۆم دابین بکەم وزوو دەست بەکاری رەنگ رەوغەن بکەم ،نەققاشی لانی کەم دەبێ ١٥ ساڵ کاری لەسەر بکەی تا دێتە دەست وەکوو تێکەڵ کردنی رەنگ و گەڵاڵە و زۆرشتی دیکە ئەوە بوو من درەنگ دەستم پێکرد ، بەڵام تابلۆکانم زۆرتر مودێلیان هەیە .

س ـ ئەوتابلۆیانە هەڵتان بژاردوون زۆرتر مایەکانیان چین ؟

ج ـ زیاتر مەنزەرەن ئەڵبەتە نەمەنزەرەی رەق و رووت مەنزەرەیەکی کەگوویایە وئینسانی بەشیوەی جۆراوجۆر تێدایە .

س ـ ئایا لە هەموو حاڵەتێک دا ئیحساسی نەقاشیت هەیە یالەحاڵەتێکی

تایبەتی دا ؟

ج – **لە هەموو وەختێک دا هەمە بەلاّم لە هێندێک جێگا فشاری زۆرترم بۆ دێ. مەسەلەن وەختێک خەریکی کارم ئەوەندە سەرگەرمم چایان بۆداناوم سێ جار، چوار جار چایەکە سارد بۆتەوەوگۆڕدراوە هۆشم نەبووە بیخۆمەوە.**

س – سووژەی نەقاشی یەکانت چۆن هەلّدەبژێری ؟

ج – **کەسێک عەلاقەی بە هونەر بێ چ موسیقادان بێ چ نەققاش بێ، چ مجەسەمەساز بێ سووژەیەکی دەست کەوێ وپێی باش بێ کاری لەسەر دەکا. بۆ وێنە شاعیرێکی لەنەزەر بگری مانگەشەوێ دەبینێ پێ خۆشە بەشیعر بینووسێ یا نەققاشێک مەنزەرەیەک دەبینێ پێی جالبە ،پێی خۆشە کەرەسەی پێویستی هەبێ ولە شەقام مەنزەرەکە لەسەر تابلۆ بکێشێتەوە.**

س – وەختێک نەقاشی دەکەی چ جێگایەکت پێ خۆشە کە کاری لێ بکەی ؟

ج – **جێگایەکی کپوکپ و بێ دەنگ .**

س – تائێستا ئەوجێگایەت بۆدابین بووە؟

ج – **تا رادەیەک .**

س – هەرکەس تاریفێکی بۆ هونەر هەیە لەروانگەی تۆ هونەر چینە و بڕوات سەبارەت بەهونەر چیە؟

ج – **ئینسان نازانێ هونەر چۆن تاریف بکا، من ناتوانم بێژم نەققاشێک هونەرمەندێکی تەواوە، یا موسیقادانێک هونەرمەندێکی تەواوە ،زۆرکەس هەن لەبازار کارگەلێک دەکەن کە خۆی هونەرە، هونەر ئیحساسی ئینسانە کە لەهەموو کەس دانیە ،لە هێندێک کەس دا هەیە کە دەتوانێ بیداتە دەرێ، جا نەققاشێک منالێکی فەقیر دەبینێ یا شتێکی لە بازار دەبینێ دێ بەتابلۆ پێشکەشی خەلکی دەکا ،ئەوە خۆی هونەرە دەتوانین بلێین هونەر ئەوەیە شوێن لەسەر رووحی خەلک دابنێ، جا شادی بکا یاپەرۆش !**

س – تائێستا لەموسابەقاتی هونەری دا بەشداریت کردووە ؟

ج – **پێش ئەوەی دامەزرێم لەدانیشسەرای بیجار بووم. لەکاری سیاقەلّەم کارم دەکرد جارێک بردمیان بۆ هەمەدان لەوێ لە موسابقەی ئاموزشگاکانی سەرانسەری ئێراندا بووم بە دووهەم.**

س – جایزەشت وەرگرت ؟

ج – **بەلّێ ۵۰۰ تمەن پوولّ وچەند کتێب و دوایی بردمیان بۆ رامسەر بەناوی ئۆردووی هونەری.**

س – تائێستا کارەکانت وەکوو نومایشگا پێشانی خەلک داوە ؟

ج – **بەلّێ ، لەشاری سەقز**

بە لایەن ئیرشـادی ئیسلامی یەوە نومایشگامان دانا کە وەها دەنگی داوە لە بۆکان و مەهاباد وسنەوە هاتبوونە تەماشاکردنی ئەو نومایشگایە

س – وابووە کارەکانت رەخنەیان لێ بگیرێ ؟

ج – بەڵێ، هەر چەند رەخنەگرەکان لە هونەردا سەررشتەیان نەبووە بەڵام رەخنەی باش وبەجێ یان لێ گرتووم کە زۆرم پێ باش بووە.

س – رەخنە چ نەخشێکی لەژیانی هونەرمەندێک دا هەیە ؟

ج – ئەگەر رەخنە بەجێ بێ دەبێ بەهۆی پێشکەوتنی هونەرمەند کە هونەرمەندی راستەقینە لەرەخنە ناترسێ.

س – تایبەتمەندی هونەرمەندێکی راستەقینەچیە وئەرکی لە بەرامبەر خەڵک دا چیە ؟

ج – هونەرمەندی راستەقینە کەسێکە کەهونەرەکەی لەخزمەت خەڵک دابێ ونەی فرۆشێ یان هونەر نەبێتە حیرفەی ئەو،زۆر هونەرمەند هەن کە بەهۆی نەبوونی ژیانێکی تێروتەسەل تابلۆکانیان دەفرۆشن کە ئەو شتە بۆخۆشم هاتۆتە پێش وابووە منداڵەکەم لیباسی مەدرەسەی نەبووە، بەپووڵی تابلۆ بۆم کڕیوە هونەرمەند دەبێ دەردی خەڵک پێشان بدا، خەڵک فێربکا، من خۆمهیچ کەس فێری نەکردووم، دەورەم، نەدیوە.بەڵام بۆنموونەچوومە ماڵێ ماموستا فەیزوڵڵا ناهید کەبە ماموستای خۆمی دەزانم ئەو منی رینمونی کردووە کە بێمە سەر ئەو سەبکە رئالیزمە بەڵام چون خۆشی کلاسی نەدیبوو نەیدەتوانی منیش باش فێر بکا،قودرەتی تەدریسی نەبوو، ئەوە کە منیش قودرەتی تەدریسی باشم نیە.بەڵام لە لایەن ئیرشادی ئیسلامی یەوە کلاسم دانا وزۆر شاگردیشم هەیە و زۆرم پێ خۆشە بێن فێر بن،ئەوەی کەدەیزانم فێریان بکەم .

س – وەکوو هونەرمەندێک چ ئارەزویەکت هەیە؟

ج – ئارەزووم ئەوەیە بچمە دێهات وشاخ وکێو بەهۆی ئەو کەرەسەوە ئەوەی دەی بینم بیکێشمەوەوپێشا- نی خەڵکی بدەم وموزەیەک لەکوردستان هەبێ کە ئەو تابلۆیانەی تێدا رابگیرێ و وەکوو فۆلکلۆرێک بۆ خەڵکی کورد بمێنێتەوە تا ئەوانەی لەداهاتوودا دێن تەکمیلی بکەن چون رەنگە کاری ئێمە ناتەواو بێ.

# بەسەرهات

گولاب ئاغایی

ئێوارە هاوینێکی گەرم بوو. تینی خۆر بەزۆر خۆی لە پەناو پەسیوی شار خزاندبوو. تەنیا لە باغەکانی قەراغ شار برە فێنکایی یەک هەست دەکرا. ناچار رووم لەوێ کرد کووچە باخەکانم هەڵبوارد چەند باڵندە لەسەر چاووکی داران خەریکی کایە بوون وخەڵک تاک تاکە وەدیار دەکەوتن.

بنەم ژێرسێبەری دارە گوێزێک بوو کە هەموو جارێ لەگەڵ دەستە براکەم وەڕەزیمان لێ دەشکاند

ئەو رۆژە کە زەینمدا رەحیم پێش من هاتبوو پشتی بە دارەکەوە دابووو دەستی لەئەژنۆ وەراندبوو و سەری وەسەر کردبوو دیار بوو پەرۆشە و بیر دەکاتەوە.

لێی نزیک بوومەوە سلاوم لێکرد. بەدەنگی من تێکرابوو. وەلامی دامەوە بەڵام هیچی دی نەگوت. لە لای دانیشتم. دەستێکم لە سەر شانی داناوکوتم:

- برا چیە؟ ئەوە بۆوا پەرۆشی؟

- چوزانم! نازانم بلێم چی

- ئاخر چ بووە؟ خۆ تۆ هیچ لەمن وەناشێری

- لێمگەڕێ!... لێم گەڕێ برینم مەکولێنەوە من زۆر چارەڕەشم.

- ئەو قسانە چن؟ چارەڕەشی چی؟

- ئەوەی بەسەر من هاتووە بۆ گێڕانەوە نابێ.

- مەگەر هەموو جارێ بۆخوت ناڵێی کە هەرکەس دەردی دڵی لای یەکێک بدرکێنێ باری خەمانی سووک دەبێ؟

تاوێک مات بوو. چاوێکی لە خۆرەتاو کرد کە بە لارەملی ئاوا دەبوو.

دەتگوت کیژۆڵەیەکی جوان و نەشمیلانەیە و هاتووە لەبەر دەلاقەی دوو نهۆمڕا سەیری کۆلان بکا ودایکی بەرەو خوار ڕاکێشی دەکا...

سێبەرەکان لەرادەبەدەر درێژ ببوونەوە. شوێنەواری هەتاو تەنیا لەسەر چلووکی دارەکان مابوو. دەتگوت دەیەوێ دەستیان لەدەست بنێ ومال ئاوایی یان لێ بکا.

ئەوجار چاوێکی لەمن کردو سەیرێکی قامکە گەورەی دەستی کردو ئەنگوستەکانی لەبەریەک ڕەواند وکوتی:

- دەزانم! ئێمەبراین خۆشی وناخۆشیمان پێکەوە بووە بەڵام بەسەرهاتی ژیانی من زۆر ئاڵۆز و تاڵە ودەترسم تۆش زوێر بکا.

- نا هەرچی بێ پێم خۆشە بۆم بگێڕیەوە.

- کاکی خۆم! بیست و شەش ساڵ لەمەوبەر لە ئاوایی یەکی دووری شار لە بنەماڵەیەکی بە ئێرودا لەدایک بووم. بابم هاتە شار و ژیانێکی خۆشمان دەست پێکرد. خەمم نەبوو. یانی نەمدەزانی خەم چیە! تا رۆژێک دایکم مرد.....

چاوێکی دیکەی لە من کرد. گۆمیلکەی رۆندک لە چاوانیدا پەنگی خواردبۆوە پیلووی لەسەر یەک دانان و ئەسرینەکانی پالاوت.

کوتم: خوا لێی خۆش بێ.

- لەگەڵ مردووی تۆ. بەڵێ نەخۆش کەوت ودەرزی

و دەرمان چارەی نەکرد و بەرەبەیانی یەکی مژاوی کۆچی دوایی کرد......

منیان بۆماوەیەک بردە لای نەنکم ولەوێ مامەوە. ئێستا دەزانم نەنکم تا چ رادەیەک منی خۆش ویستووە

هێندەی تێوەرنەسوورا وە باوکم ژنی هێنا و منی بردەوە لای خۆی. باوەژنم تا کاتێک منداڵی نەبوو خۆشی دەویستم. نارەحەتی نەدەکردم، لێی نەدەدام و لێم تووڕە نەدەبوو. بەڵام هەرکە ئەحمەدی بوو گۆڕا. بۆنی خۆشەویستی لێ نەدەهات

من وئەحمەد وێگڕا گەورە دەبووین ووەک دوو ئاواڵ رامانده‌بوارد. ئەحمەد بە پێچەوانەی باوەژن زۆر بە رەحم و رەزا سووک و لەسەر دڵان بوو.یەکدیمان زۆر خۆش دەویست. خۆشی و ناخۆشیمان پێکەوە بوو. هیچمان لێک نەدەشاردەوە.

ئەگەرچی لەو گەورەتر بووم بەڵام ئاواڵ بووین و وێکرا دەچووینەوە، مەدرەسە. من دیپلۆمم وەرگرت ولەماڵ دانیشتم.

من دڵم کیژۆڵەیەکی گرتبوو و خۆشم دەویست ناوی کەژاڵ بوو. دراوسێ خۆمان بوو. ئەحمەد بەم باسەی دەزانی. ئەویش کەیفی بەخاڵۆزاکەی من دەهات. قەرار بوو هاوین بنێرینە سەریان وزەماوەند بکەین.

رۆژێک باوەژن گازی کردین. رووی لە ئەحمەد کرد و کوتی:

– وەرە یەکی باشم بۆ دیتوویەوە بزانە پێت چۆنە بۆت بخوازم؟

– من دوو ساڵم ماوە دەرس تەواو بکەم. بەڵام جارێ بزانم کێیە؟

– کەژاڵ

بە بیستنی ئەم قسە مووی لەشم بوونە نەشتەر و لەهەیبەتان لێوم کرۆشت ئەحمەد چاوێکی لەمن کرد یانی من ئاگادار نیم. منیش لەدڵی خۆمدا کوتم قەیدی نیە.

– دەی دەڵێی چی؟

– دایەگیان من ژن نایەنم. ئەگەریش بێنم کەژاڵ نایەنم.

– ئەدی کێ دێنی؟ کێت دەوێ؟

– من بێریم خۆش دەوی..

– ئەیەرۆ بابانم خرا بوو قوڕم وەسەری ئەتۆ بێریت بۆچیە؟ نەکەی ئەم کچە رەق ولاوازە بێنی.

– دایەگیان ئەگەر قەرارە ژن بێنم بێری دێنم و کەژاڵم ناوێ.تازە وەختی ژن هێنانیشم نیە!

– ئاخر بۆ ناتەوێ چیەتی؟ جوان نیە؟ دەوڵەمەند نیە؟ خانم و خاتوون نیە؟ چی؟

– نا دایەگیان ئەو گراوی رەحیمە!

هەرکە ئەوەی بیست دەرهەڵبوو.

– ئای ئای! کوڕە من نەمگوت خۆ لەم مارە

سیسە نەدەی کلاوت لەسەر دەنێ! ئەوەتا ئەم خاڵۆزا مردەڵەیەی بۆ تۆ داناوە و ئەم کەژاڵە خڕوخۆڵەشی بۆخۆی هەڵبژاردووە نابێ شتی وا نابێ .....

پاش ئەم رووداوە من لە ماڵ وەدەرکەوتم. خۆم تەحویلی سەربازی داو دوو ساڵ دوور کەوتمەوە. جار جار ئەحمەد سەری دەدام و نامەی بۆ دەنووسیم. بەڵام من بۆ سەردانیش نەچوومەوە تا دوو مانگ لەمەوبەر کە هاتمەوە بە پەلە سەرێکی ماڵێم دا و گەڕامەوە و بۆ هەمێشە ئەو شارەم بەجێ هێشت و پێم تێ نەناوە.

وردە وردە دەهات لەبیرم بچێتەوە کە بابم هەیە. کەژاڵ هەیە! خۆشەویستی هەیە! تەنیا تۆم بە کەس و خەمخۆری خۆم هەڵبژارد – ووە و بەس. بەڵام دوێنێ ئەحمەد نامەی بۆ نووسیبووم.

نووسیویەتی:

"من سەربازیم تەواو کردووە، بێریم هێناوە بە قسەی دایکم نەکرد. بەڵام کەژاڵ کە دەیزانی مەیلی ئەوت ناوە مێردی کردووە.

کوتم:

– ئەوجار دەزانم بۆ پەرۆشی؟

– بەڵێ بەڵام بۆ شوو کردنی کەژاڵ بەپەرۆش نیم بۆ ئەوە بە پەرۆشم کە باوەژن چووەتە لای کەژاڵ و گوتوویەتی:

– رەحیم دەزگیرانی هەیە و لەسەر پشتی لانک لێی مارە کراوە! دایکم! تۆی ناوێ برۆ بۆخۆت مێرد بکە چاوەڕێی ئەو مەبە!

رۆژی نەمابوو. بەرە و ماڵ بووینەوە رووم تێکرد و کوتم دیوتە...ئەم پەلکە زەردانە لەژێر پێی ئێمەدان ڕۆژیک سەوز بوونە وبنکەی مەل وباڵندەی دەنگ خۆش بوونە وسێبەریان لە میوە کردووە. ئێمەش ئاواین چارەنووسی ئێمە وانیە کە ئێمە دەمانەوێ هەرچی بووە رابردووە بیری لێ مەکەوە. سەر لەنوێ دەست پێ دەکەینەوە!....

دەستمان لەدەستی یەک ناو بەرەوماڵ بووینەوە تا خۆمان ساز بکەین و سەرلەنوێ دەست پێ بکەینەوە.

**فۆرمی ئابوونمان**

**شمارە**

ناو........شۆرەت.........دانیشتووی........

........ تمەنم بەحیسابی ژمارە ٥٤٠٠ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی ورمێ گرت و فیشەکەم وتیرای ئەم بەرگە بۆ نادرن. لەژمارە.......ڕا هەتا........گۆواری سروەم. بۆ بەرێ بکەن.

ناونیشان.........................................

..................................................

# ئاوێنەی ئەدەبی

**ماکۆ :** بایزید وەتمانکەل

ئەم شیعرەی بۆت ناردووین وەزنی نیە و لە هەستی شاعیرانە بێ بەری یە .شیعری نوێ ڕێز کردنی وشە لە پەنا یەک نیە . ئەویش وەزنی دەوێ یانی شیعرێکی وەزنی نەبێ چ کۆن و چ نوێ شیعر نیە ! بۆ وێنە :

**لە من وا بوو دارو دەوەن**
**هەمووکەس بە من پێدەکەنێ**
**بەڵێ رقم لە هەمووکەس بوو**
**پێم خۆش بوو کەس نەبینم**

**بۆکان:** محەممەد عەزیزی

لە شیعرەکانتدا وا دەر دەکەوێ کە هەستی شاعیرانەت هەیە . بەڵام ئەم شیعرەت لاسا کردنەوەیەو حەول بدە بۆ خۆت سووژە هەڵبژێری بەرجی ئەوەش شیعرەکەت لە باری وەزنەوە ناتەواوە و نەمانتوانی چاپی بکەین .

**کەرەج :** تەحسین سەلیم شیروانی

زۆر وشە هەن کە لە شیعردا جوان نین و ئەگەر شاعیر بۆی بلوێ خۆی لێ نەدا باشە . وەک " کوان " و " بیهناگەنی " و " پیس"و ...

چاوەروانی بەرهەمی جوانتری تۆین .

**خانێ :** عەلی شەعبانزادە

شیعرەکەت لە باری قافیەوە لەنگە . وشەی "ملک" و"عومر" نابنە قافیە . لە باری وەزنیشەوە کەموکووڕی هەیە . بۆ وێنە :

**ئەگەر شەشدانگی دونیا**
**موڵکی تۆ بێ**
**هەزار ساڵی تەواویش**
**عومری تۆ بێ**
**ئاقیبەت قەبرە جێگە و**
**مەکانت**
**لە هەق خافڵ مەبە**
**ئاگا لە خۆت بێ**

**کاشان :** عیسا تاهیر محەممەد

شیعرەکەت جوانە بەڵام لە وادەی رابردووە. چاوەروانی بەرهەمی تازەین .

**سەقز :** ئەسعەد محەممەدی

براگیان شیعری " شینگێری سەقز " زۆر لاوازە وهێزو پێزی شاعیرانەی نیە . لە باری وەزنیشەوە لەنگە وەکی ئەم شیعرە :

**چین ئارون خەڵکی چولە**
**ئاوت شار**
**شار چۆل و وێرانە نەما**
**بلوار**

---

**چون خۆشەویستان ولایەنگرانی سروە لە دەروژووری وڵات بە نامەی جوان ورازاوە داوای"فۆرمی ئابوونمان"یان کردووە ، ئەوە حۆنەتی ئابوونمان لە دەروژووری وڵات بەو شێوە رادەگەیەنین**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆنێو خۆی وڵات | ۲۰۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆ وڵاتە دراوسێکان | ۳۸۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆ هیند وئوروپا | ۴۲۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆئامریکا وخاوەری دوور | ۵۰۰ | تمەن |

**ناونیشان : اورمیە ـ صندوق پستی ۷۱۷ ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ تلفن ۰۳۵۸۰۰**

**بۆ ئەم خوێندکارانە کە لە زانستگاکانی دەرەوە دەخوێنن ( ئەگەر بەڵگەی خوێندکاری خۆیان بنێرن ) هەل و مەرجێک پێک دێنن کە گۆواری سروەیان بەنیوە قیمەت پێ بگا .**

میسرەعی هەوەڵمان وەک خۆی نووسیوە ئەگەر چی بۆمان ساخ نەبۆوە یانی چی ؟!

**سەردەشت :** بەختیار رەحەسەنی

بۆمبارانی کیمیاوی سەردەشت لە لایەن بەعسی فاشیستەوە رووداوێکی دلتەزێنە ودڵی هەر ئینساندوستێک دەخاتە دەریای ماتەم و پەژارە . شیعرەکانت لە مەڕ ئەو رووداوە دڵتەزێنە بە داخە کز بوون و لە زۆرجێگا لە باری وەزن و قافیەوەکەم و کووڕیان تێدایە .هیوادارین بەرهەمی باشتر و جوانترمان بۆ بنێری .

**خانێ :**کەماڵ سوڵتانی

ئەو شیعرانەی بابا تاهیری عوریانن کە بەداخەوە بە ناتەواوی بۆت ناردبووین و هەڵەیان تیدا بوو ئێمە دروستی شیعرەکان و ماناکەیانت بۆ دەنووسینەوە :

بابا تاهیر :

**سرم سودای گیسوی تودارە**

**دلم مهر مە روی تو دارە**

**اگر چشمم بە ماه نوکرە میل**

**نظر برطاق ابروی تو دارە**

ماناکەی بە کوردی:

**سەرم شێت و شەیدای پرچی تۆیە**

**دڵم ئەویندار ی مانگی رووی تۆیە**

*** * ***

**ئەگەر چاو لە مانگی نوێ دەگێڕم**

**بۆ ئەوەیە کە وەتاقی بڕۆی تۆ دەچێ**

بابا تاهیر :

**دلی دێرم چو مرغ پاشکستە**

**چو کشتی برلب دریا نشستە**

*** * ***

**همە گویند کەطاهرتاربنواز**

**صدا چون میدهد تارشکستە ؟**

ماناکەی بە کوردی :

**دڵم وەک باڵندەی باڵ شکاوە**

**وەک کەشتی لە لێواری دەریا راوەستاوە**

*** * ***

**خەڵک لە منیان دەوێ کە تاریان بۆ لێدەم**

**بەڵام تاری شکاو چۆن دەنگی لێ دێ ؟**

**لاوێن :**عوسمان دلێرە

مانای دو شیعری فارسیت لێ پرسیوین . ئەمەش دەقی شیعرەکان لە گەڵ مانا کوردی یەکەی :

فارسی :

**گلش درزیر سنبل سایە پرور**

**نهال قامتش نخلی است نوبر**

*** * ***

**ز عشق آن گل رخسار سوری**

**چو بلبل نالە وافغان برآور**

کوردی :

**. گوڵی روخساری یارم لە ژێر سایەی سومبولی پرچی دا پەروەردە بووە**

**نەمامی باڵای دەڵێی داری خورمایە و تازەی بەر گرتووە**

**لە عیشقی ئەو روخسارە سورو جوانە**

**وەک بولبول دەنگی هاوار و فیغانم بەرزە**

**سەقز :**خوشکە شەهلا حەسەن زادە :

نامە جوانەکەت ها نماندەدا بۆ تێکۆشانی زۆرتر لە پێنا و خزمەت بە فەرهەنگی کورد. شیعرەکەت پڕە لە هەستی شاعیرانە و زەوقی شیعر گوتن . بەڵام هێشتا شارەزایی رێبازی شیعر گوتنت پەیدا نەکردووە. بە تێکۆشان و خوێندنەوە و پرسیار دەتوانی ئەم شارەزایی یە وەدەست بخەی. قسەیەکی خۆشت بۆ ناردووین زۆر جوانە و کەلکی لێ وەردەگرین .

* * *

**کەیفی برادۆستی**

ئەی ئەو کەسەی خۆشەویستیم
بەرزە بەقەت بەرزی بالآت
ئەی ئەو کەسەی
تەمەن تارای بووکێنیتە وگولّی ئاوات
لە کەژاوەی یەکەم چرکەی بڕواتەوە
وەکوو گولّی بەربەڕۆژە
چاوی ماندووی رێگای دووری
بۆ عەشقی تۆ دەکاتەوە
ئاوڕ لەخۆر دەداتەوە
ئەی ئەو کەسەی
تۆ هەمیشە لەپێش چاومای
لەنێو دەنگی پیتەکانی گڕی ناومای
لەگەڵ گوڵ وداهاتنی بای بەهارای
لەگەڵ بەفر وکزەی ساردی بەفرانبارای
ئەی ئەو کەسەی
تۆ هەمێشە لەپێش چاوی
سۆزی سەختی ناو هەناوی
هەتا مابم هەتا ماوی
لەبەر دڵ ولەناو خوێن ولەپێش چاوی
لەبیری مندا نەک مۆمی
هەزاران مۆم ، تۆ هەتاوی
ئەی ئەو کەسەی
وەکوو فرمێسک زیخی چاوم دەشۆیتەوە
خەمەکانم هەڵدەمژێ
زامەکانم دەخۆیتەوە
وەکوو هەناسەی گەرم وسارد
دێی و دەڕۆی
بەناو بۆریی سیەکانما
لەپێش چرای بەربلاّوی دیدەکانما

دێی و دەڕۆی
کانی یەکانی خەمی خەستی هەموو جێتن
لە باوەشتا ئارام دەگرن
کەچی دەریای بەومەنی دڵی
روو دەکاتە چیای کەش وسەختی بالآت
بەسەر پەڕەی گڕی بیردا
هەڵ ئەزنێ
واز ناهێنێ تا دێتەلات
بڕیارێکە و لەگەڵ خۆی دا
بۆ داوێنت دا بچەی
گشت دڵۆپێک لە میهری پاک
لەپێناوی چاوەکانتا بێ بچەمێ
تۆ ئەی لە هەتاو گەرمتر
تۆ ئەی سیلەی هەنگی بیرم
تۆ ئەی چڕتر
لە مەودای توانا و تەقدیرم
بەینێکی کەوا ئەڕۆیت و
چارەنووست لەرێتایە
منیش نوقمی گۆمێک دەبم
بێ سەرەتا وبێ ناوەندی وبێ کۆتایە
دەمێنمەوە هەر وەکوو ناو
وەک قەراغی رووخانەیەک
لێی تۆرابێت شەپۆلی ئاو
وەکوو هەڵۆیەکی نامۆ
کەوتبێتە ناو کەمینی تەل رێژراوی
هەتا ئەژنۆ
لەگەڵ هەموو ئەمانەشا
ئەمزامانەی وان لەناخ ولەسەر لەشا
خۆشم دەوێ بەسۆزێکی شێتانەوە
دەتخەمە ناو دەروونم وگلێنەی ئەمچاوانەوە

م. سالار

له شه‌وه‌زه‌نگێكی تاری
شه‌وگارێكی
ئه‌م زستانه
له چواردیوارێكی ژووری
له‌به‌ر چرا
خامه‌ی ده‌ستم چاوه‌ڕوانی
هه‌واڵێك بوو
گه‌رچی ئه‌و له ئه‌ندیشه‌مدا
له خه‌یاڵی ئه‌و شه‌وه‌مدا
نه‌ك خونچه‌یه‌ك
نه‌ك منداڵێك
به‌هارێ بوو
ئا ئه‌و شه‌وه
تا نیوه‌ی شه‌و
تا شل بوونی خامه‌ی ده‌ستم
یادی ئه‌و بوو
فلیمێكی گیانبازی بوو
له‌پێش چاوم
داستانێكی پڕله هیواوپیاوه‌تی بوو
له هه‌ناوم
یادی ئه‌و بوو
ئه‌و شاسواری ئه‌و شه‌وه بوو
وه‌فاداری شه‌هیدانی
رێی خه‌باتی ئه‌م گه‌له بوو
تۆڵه‌ی دایكانی ره‌ش پۆش و
منداڵه بێ نازباوكه‌كان
سوته‌مه‌دۆی به‌جێ ماوی گوێسه‌بانه‌ی
دێهاته‌كان
بووه رقێكی ئه‌ستوورتر
له سینه‌ی دا
له جه‌سته‌ی دا ، كردیه ئاگر
كردیه هه‌وری ره‌ش و تووڕه
به‌سه‌ر سه‌ری سیخوڕانو
نۆكه‌رانی به‌عسیانا
كردیه بارانی رێژنه‌ی گولله
به‌ڵام سه‌د داخ
سه‌د مخابن
هه‌ر ئه‌و شه‌وه له‌بۆ ساتێ
له تاریكایی خامۆشی ئه‌نگوسته‌چاو
خه‌نده‌ی سه‌ر لێو له ده‌روونا
بوو به زووخاو
ئاگام لێبوو رۆڵه رۆ بوو
رۆڵه‌ی به‌بازووی ئه‌م گه‌له
هه‌ڵۆ رۆ بوو
هه‌ر ئه‌و شه‌وه
خوێنی خۆی كرده
شاگڕی
ئه‌و مه‌شخه‌ڵه
وه‌ك فریشته به‌ره‌و به‌رزی كشا...كشا
گه‌یشته ئاسمان
بووه ئه‌ستێره‌ی پڕشنگداری
كوردستان
ئه‌و نه‌وه‌ستا
گه‌ڕا....گه‌ڕا
تا گه‌یشته كاروانه‌پڕ سه‌روه‌ریه‌كه‌ی
شه‌هیدان
هه‌ر ئه‌و شه‌وه
به‌سه‌رسه‌ری رێبوارانی
ته‌واوكه‌ری رێی خه‌باتیان
هه‌موو تێكڕا ئه‌یانجریواندوئه‌یانووت
یا ئازادی
یاخود نه‌مان

کاکەباسی هاوکارم بە
پەلە وەژوور کەوت و رووی
تێکردم :
- هەمەوەند پوولم دەیە
گۆشت بووقەلەموونت بۆبکڕم
زووکە زوو! تا تەواو
نەبووە !
من کە دارونەدارم سەت
وپەنجا تمەن بوو وئێستاش
دە رۆژی مابوو مانگ تەواو
بێ پێکەنیمو گوتم :
- وەرە دانیشەکارەکانت
بکە ! من بوولێ گۆشت
قەلم لەکوێ بوو ؟
- زۆر هەرزانە . کیلۆی
سی تمەنە ! سی تمەن !
- چی ؟ سی تمەن ! راست
دەکەی ؟ سی تمەن !
- بەراستمە ، سی تمەن و
قرانێک مەدە !
- چاکە وەرە دوودەقیقە
دانیشە دەڕۆین ! جارێ
پێم بلێ ئەو قەلە لەکوێ
دەفرۆشن ؟ گۆشتەکەی
چۆنە؟ تۆ خۆت کڕیوتە؟ خۆ
هەروا نابێ !
- بۆخۆم دوێنێ سێ کیلۆم
کڕی بە نەوەد تمەن ! پێنج
قەلی تەواوی کێشا !
- مردووت مرێ . چۆن
پێنج بووقەلەموون دەبێتە
٣ کیلۆ ؟ بوو- قە- لە-
موون ! هەر ناوەکەی سێ
کیلۆ دەبێ !
- ئاخر بووقەلەموونی
تەواویش نین !
- ناکا تازە لەهێلکەی
هاتبنە دەر ! ؟
- ناوەڵڵا، ئی وایان
تێدا حەفتاسالیش دەبن !
سەرم سوڕ مابوو .
نەمدەزانی دەلێ چی. بلێی
گرانی شێتی نەکردبێ !
بلێی دەسەفوشتی وادا
عەقلی نەگۆڕابێ، تێی
ڕاخوڕیم :
- هەتیو خودام بەگژدا
کردی ! ئەوە تۆ دەلێی چی؟
قەل و حەفتا سال !
- عەرزم کردی ئەوانە
قەلێکی تایبەتین .
- تایبەتی چی ؟ چۆن
قەلی تایبەتیش هەیە ؟
- "بوو" یان کەمە .
- یانی چی ؟

- یانی"بووقەلەموون" نین هەر قەلە....
ئەوجار تەواوێک ترسم رێ نیشت. هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە ئەم هاوکارە ئیداری یە خۆشەویستم شێت بووە! بەرووخۆشی و لەسەرە خۆ لێم پرسی:

- چاکە ،چاکە، هەباس گیان .چی دیکەشیان کەمە؟

- "موون"ەکەشیان کەمە. هەر "قەلی" رووتن! کەمێکیش رەنگیان رەشە! گۆشتەکەشیان هەر کەمێک رەنگی رەشە!
لە حاڵێکدا دڵم بۆی دەسووتا وبەزەم پێی دەهات گوتم:

- نەکا قەلەڕەشە بێ؟
هەڵبەزیەوە وزیقاندی.

- ئافەرین، بژی بۆ هۆشت! راستخۆیەتی!

- دەیجا دەتەوێ گۆشتی "قەلەڕەشە" بخۆین و هەموومان بمرین!

- بۆ دەمرن؟ ئێوە چیتان لە ئێمەزیاترە. تا ئێستا نەهار و شامێکمان بەو گۆشتە خواردووە وزەق و زیندووشین.

- ئەوجار کەزانیم شێت نەبووە وبەراستی دەڵێ .بە تووڕەیی یەوە گوتم:

- نا ،کاکە ،نا، ئەمن گۆشت قەلم ناوێ. نۆشی گیانتان بێ .ئێمەناخۆین!
ئەوجار نۆرەی ئەو بوو ئەمن بەشێت بزانێ و بیر کاتەوە مێشکم لەئیدارەدا، شڵەقاوە وشعوری ژیانم نەماوە. بە قەڵسی چاوی تێ بڕیم وگوتی:

- ئەتۆ هەروا کەودەنی! دە هیچ ناگەی! عەزیزەکەم قەل وقەلەموون وبووقەلە ـ موون وبۆقلە هەمووی هەر یەکن! تۆ ئەو گۆشتە دەبەیەوە ماڵ وبەمنداڵا ن دەڵێی گۆشت قەلم کڕیوە ئەوانیش وادەزانن بوو- قە لە- موونە -کەی خۆتە. دەیخۆن وزۆریش رازی دەبن. ئەتۆش رازی بوونی ئەوانت دەوێ؟ وایە؟
نەمدەزانی وا فێڵباز و سەهەندەیە .لێم پرسی:

- ئەو کەڵەکانە لەکێ فێر بووی؟
دەستی لەسەر کەمەری دانا وبەئیفادەوە گوتی:

- لەچڵەوکەبابی سەر جادە ونێو شارەکان!

- چۆن؟ ئەوانیش گۆشتی قەلەڕەشە بەناوی گۆشت **بووقەلەموونە** دەرخوارد ی موشتەری دەدەن؟

- نا ،خراپترا! زۆرخراپتر ئەوا نگۆشتی گوێ درێژ بە ناوی گۆشتی مەڕ دەدەن بە موشتەری وکەسیش دەنگی لەبەر دەرنایە!

- شتی واچۆن دەبێ؟ موشتەری مەگەر تێ ناگا؟
وەک فیلەسوفێک کە بیر دەکاتەوە کەمێک بێ دەنگ بوو .پاشان سەری هەڵبڕی وگوتی:

- مەسەلە ئەوەیە. کە خەڵکی دەوروزەمانی ئێمە سەرسەری وبێ فکرن! لە شتی ورد نابنەوە .خەتاشیان نیە. ژیان بۆتە پەلە پەل و هەلەهەل وتالووکەوتێک هاویشتن! بەپەلە برو .زوو وەرەوە! زوو بگەیە! زوو هەستە، زوو بنوو! عەسری ماشێنە! لە بارودۆخی

وادا کێ وەختی ئەوەی
هەیە بزانێ چ دەخوا! چۆن
دەچێ وچۆن دێتەوە! موسافیر
ماندوو وبرسی و تینوو لە
بیابانێک لە قەراغ جادە
هەڵی دەرێژن و دەڵێن
فەرموون شام بخۆن!موسا-
فیری خەواڵووی گێژوکاس لە
ترسی ئەوەی شامی وەبەر
نەکەوێ بە پەلە پەل خۆی
دەگەیەنێتە مودیری
ڕەستوران ودەڵێ : قوربان
چڵەوکەباب! چڵەوکەبابی
لەپێش دادەنێن و ئەوجار
لەترسی بەجێ مان
چڵەوکەباب بەچوار پاروو،
قووت دەدا وسیغارێک بەبا
دەکا و هێشتا دەست ودەمی
نەشتۆتەوە بووقی
ئوتوبووس دەگوێی
دەسریوێنێ ." لطفا " جا
نمانیدا! " بەڵێ لە هەل و
مەرجی وادا ،لەژیانی ئاوا
بە هەڕەمە وپەلەوخۆ
کوتان دا هیچ شتێک
ناناسرێتەوە . گۆشت مەڕ و
گۆشت کەر دەبنە یەک !
چاک وخراپ لێک دەدرێن !
تەنیا "ناو" دەمێنێتەوە !
قەتم وا دەکاکەباس
درانەدەدیت . نەمدەزانی
ئەو پیاوە بێدەنگە ئاوا
ورد ووشیارە . بەسەر
سوڕمانەوە لێم پرسی :
- ڕاستە ژیان وای
لێهاتووە کە مەجالی ورد
بوونەوە نادا . بەڵام لەو
هەموو موسافیرە کەس نازانێ
چی دەرخوارد دراوە ؟
- زۆرکەم! موسافیرقەت،
فکری بۆئەوە ناچێ گۆشت
کەری درابێتێ . تەنیا
دەزانێ کە ئەوجارکەبابەکە
چیرە وناجوورێ. بانگی
گارسۆن دەکا و دەڵێ
کەبابەکەت نەبرژاوە یان
گۆشتەکە کۆنە وبەس!
ئەویش سەت سوێندی بۆدەخوا
کە ئەو کەبابە لەگۆشتی
ران ساز کراوە ! موشتەری
بە دوو سێ قسە وسوێند
ئەرخەیان دەبێ و دەست بە
خواردنی چڵەوکەباب دەکا .
تەنیا ئەوەندە یەهێندێک
زیاتر ددانەکانی دەکاردێنێ
و شەویلکەی هەڵدەسوورێنێ.
ئەوەش خۆی وەرزشێکە !
بۆ ئەوەی کۆتایی بە
قسەکانی بێنم وباسی قەل
لەبیر نەچێتەوە لێم پرسی :
- گۆشت قەلەکەی تۆش
ئاوا چیرەوجوونی (جاوینی )
زۆرتری دەوێ ؟
جوابی دامەوە :
- بەڵێ ،ئەلبەتە! دوێ
شەو خێزانم کوتێکی نا
دەمی وزیاتر لەدە دەقیقە
هێنای وبردی و پاشان بە
ساغی ڕۆی هێشت (قووتی دا )
لەئاخری دا دەزانی چی
گوت :
- ڕەنگە گوتبێتی .ماڵە
بابت وێران بێ . ئەوە
پلاستیکە یا گۆشت قەل !
- نەخێر! نەخێر !نالێم
دەهیچ ناگەی ؟ گوتی :
- بەزیادبێ هەرچی بێ
گۆشت قەلە .
بەڵێ هەموولەناودەگەڕێین
کارت بەنێوەرۆک نەبێ !
بەهەرەمەهەستا مەسەر پێ
وگوتم :
- لەسەری مەڕۆ بابڕۆین
بیکڕین . پەلەی بکە! نەوەک
ئەویشمان وەبەرنەکەوێ .

# ئاژەڵ

ڕەسووڵ وەیسی

٣

## ڕێگای لێگرتنەوە

ئەو نەخۆشی یە زۆرتر لەو ڕێگەیەوە :

١- میز و پیسایی .

٢- خوێن و ئارەقی ئاژەڵی نەخۆش .

٣- گۆشتی نەخۆش کە لە ناوچەیەک بۆناوچەیەکی دیکە رادەگوێزترێ .

٤- بەهۆی پێوەندی لە نێوان ئاژەڵەکاندا بڵاو دەبێتەوە .

٥- ڕێگای سەرەکی چوونە ژووری ڤیرووسی تاعوون بونێو دەزگای گەواریشە .

ئاژەڵی حەساس :

## ئاژەڵی حەساس

١- گا ٢- گامێش ٣- پالاغ وگوێلک ٤- مەڕوبزن بەو نەخۆشی یە حەساسن .

نیشانەکانی نەخۆشی :

## نیشانەکانی

الف : خولی نوستووی (کمون) لە هەل ومەرجی ئاسایی دا بەتایبەت ئەگەر نەخۆشی بۆ یەکەم جار هێرش بکاتە ڕەوەی ئاژەڵ دەگاتەچوار تا پێنج ڕۆژ.

ب :لەناوچەیەک دا کە نەخۆشی لەپلەی دووهەم و... بێتە ناوچە ،خولی نوستوویی دەگاتە ١٥ ڕۆژیش .

ج: نیشانەکانی دیکە بریتین لە :

١- نوبەتێی توند.

٢- قەبزبوون پاش ئیسهالی توند.

٣- هەڵمسانی گۆلۆبۆلەکانی سپی .

٤- ئەستوور بوونی پێستەکان(مخاطات) هاوڕێ لەگەڵ کێم و زووخاو.

٥- لەناوچوونی ئیشتیا

٦- لەکاوێژ کەوتن.

٧- لەوکاتەدا ئاژەڵ لەسووچێک دەوێستێ وگوێیەکانی شۆڕ دەبنەوەو سەری دادەخا. بەڵکوو لە هێندێ گاوگۆل دا حاڵەتێکی ڕەوانی پێک دێ کە ئاژەڵ هێرش دەکاتە ئینسان و گەل وپەل و ئەگەر لە جێگایەک بەسترابێتەوەهەوڵ دەدا خۆ ڕزگار بکا .سمکۆڵ دەکا کە ئەو حاڵەتە زوو تێپەڕ دەبێ و لە پاشان نۆبەتێ دایدەگرێ.

هـ : ئاو لە چاوانی دێتەخوارو پێستەی چاوی سوور دەبن وبەرە، بەرە چڵک دەکاو ولە دەموچاوی دەڵەمە دەبەستێ و لە لمبۆزی ئاژەڵ توێخی وشک بوو دەبیندرێ وئاوی دەمی ئاژەڵ لە ڕادەبەدەر چڵکن ودەوروبەری لووتی سوور هەڵدەگەڕێ .

بەرگری:

## بەرگری

الف : لە وڵاتەکانی پێشکەوتوودا کە بەدوور لە تاعوونی گایە بەدامەزراندنی ئیزگای قەرەنتینە لە هاتنەژووری ئاژەڵی نەخۆش لەوناوچانەراکە نەخۆشی یان تێدایە لە پەیدابوونی

نەخۆشی بەرگری دەکەن.

ب :واکسینەکردنی هەموو ئاژەڵەکان (گاوگامێش و...)

ج: کوشتن وسووتاندنی ئاژەڵی نەخۆش .

**نەخۆشی پیرۆپلاسمۆز (زەردوویی)**

## زەردوویی

ئەو نەخۆشی یە لە زوربەی ناوچەکانی وڵاتەکە — ماندا بەتایبەت لە ئازەربایجانی رۆژئاوا لە گاوگۆل ومەڕدا دەبیندرێ و لە لایەن ئاژەڵدارەکانەوە بەنەخۆشی زەردوویی(یرقان) و بەزمانی تورکی ( سارلیق) ناسراوە ولەهێندی ناوچەدا بەنێوی تایبەتی ناوچەیی نێو نراوە کەبریتین لە (نەخۆشی خوێنەمیزوگەنەتۆش نێو دەبەن وبەرە بەرە، نیشانەکانی چۆنیەتی نەخۆشی یەکە پێشان دەدا کە بریتین لەتاوی توند (٤١و ٤٢ پلە، کەم ئیشتیایی وکەم خوێنی ودیتنی خوێن لەناو میزدا . زەردایی دەپیلووی چاوان وکەلاکەدا دەبیندرێ. لەو نەخۆشی یەدا تۆرەمەی کرم(انگل بابزیا) دەچێتە ناو گولۆبۆلەکانی سووری خوێن ودەبێتە هۆی لەناو چوونی گلۆبۆلەکان و لە ئاکامدا هاورێ لەگەڵ خوێنە میز دەبیندرێ. هەروەها سپڵ (طحال)یش لەرادەبەدەر گەورە دەبێ وبەهۆی زیاد بوونی کار لەو نەخۆشی یەدا سکەشۆرە وقەبزبوون بەین بەین دەبیندرێ. رەنگی پیسایی بەهۆی ئەملاحی سەفراوی زەرد دەبێ و کاتێک کە تفاق زۆر دەخوا سەفرا ئازاد دەبێ و لە ئاکامدا لەو ناوچانەی کە نەخۆشی زەردوویی هەیە سکەشۆرە (اسهال) رەنگی زەرد بەخۆیەوە دەگرێ.گوێلکەکانلە بەرامبەر ئەو نەخۆشیانەدا تا ماوەیەک لەئەمان دان . (دیارە ئاسەواری ئەو نەخۆشیانە لەو گوێلکانەدا دەبیندرێ کە لە دایکی ئالوودە بەو نەخۆشی یە دەبێ)

**تەنەوەی نەخۆشی:**

## تەنەوەی نەخۆشی

ئەو نەخۆشی یە لە رێگای گەنەی دەجۆراوجۆر لەرەگەزی (بابزیا) بە گۆاندارانی مونتەقیل دەبێ و زۆرتر لەرێگەی لیکاوەوە دەچێتە ناو خوێنەوە و دەبێتە هۆی لەناوچوونی گلۆبۆلەکانی سووری خوێن

**نیشانەکانی**

## نیشانەکانی....

لە گاوومەڕدا نوبەتێ— یەکی توند بە رادەی (٤٢ ٤١ پلە )زەعف ،بێ ئیشتیایی سوستی، کاوێژنەکردن، کەم بوونی شیر لە نیشانەکانی سەرەتایین. لە رەدەی ، دواییدا هەناسە توند ودڵەکوتە توندتر دەبێوبێ رەنگی دەپیلوی چاو،زێ و (گەڵ وگوان)ی مالاتی مێ ینە ولە رەدەی دواییدا خوێنەمیز یا گۆڕانی رەنگی

میز لە ماڵاتی ئاوسدا دەبێتە هۆی لەبەرچوونی بێچووی ناوسک و لەنێو چوونی ئاژەڵەکە. بەلام کاتێک ئاژەڵەکە ساغیەتی خۆی وەدەست هێناوە دەبێ چاوە دێری پێویستی لێ بکرێ. وەکوو چۆنیەتی دانی تفاق.

**دەرمان :**

## دەرمان

دەرمانی کارێگەر بە نێوی ئاکاپیرین (پیرۆڕازی) کە لە موئەسیسەی رازی کەرەج بەدەرسەدی جۆراوجۆر (٢% و٥%) وەدەشوشەکانی ٥ سی سی یا ١٠ سی سی دروست دەکرێ و بۆ هەر ٥کیلۆ قورسایی ئاژەڵی نەخۆش بە رادەی ١/٤ ی سانتی میتر بەشێوەی ژێرپێستی لێی دەدرێ

**چەند خاڵی گرینگ :**

## چەند خاڵی گرینگ

١- لە ئاژەڵەکانی زەعیف ئەگەر نەخۆشی بە شێوەی توندوتیژ ببیندرێ یانی ئاژەڵ خوێنەمیزی هەبێ وتای بگاتە (٤١) پلە رادەی تەزریق کەمدەکرێتەوە وبە وەخت تەزریق دەکرێ.

٢- پاش تەزریق کردن سورەنگ وسەر سورەنگ دەبێ ئیستریل بکرێ واتە لەناو ئاودا بکوڵێندرێ تا میکرۆبەکانی لەناو بچن.

٣- لە کاتی گۆڕانی رەنگی دەرمان،نابێ کەلکی لێ وەربگیرێ.

٤- هەمیشە لە جێگای فێنک ودوور لە نوور و گەرما رابگیرێ.

**بەرگری :**

## بەرگری

بەربەرەکانی لەگەڵ گەنە

الف :سەمپاشی کردنی جێگای ئاژەڵ: پاش وەدەر کەوتنیئاژەڵ لە تەویلە و هۆڵ دا دەبێ سەمپاشی بکرێ وماوەی ٢٤ سەعاتی تەواو دەرک و پەنجەرە و هەواکێش قایم بکرێن.

ب : سەمپاشی ئاژەڵ (حەمام پێکردن) گایەکانی نەخۆش . باشتر وایە لەرێگەی سەمپاشی کردن بەرگری بکرێن. بەلام چاکترین رێگە بۆ مەڕان حەمامپێکردن لەحەمامەکانی دژی گەنە (سیار- سابت).

**سەمەکانی کە بۆ کەڵک وەرگرتن دەبن و رادەی، پێویستی ئەوان :**

## رادەی پێویستی سەم

١- سەمی نگون بەڕادەی ١/٥ در هەزار.

٢- سەمی ئازونتول بە رادەی یەک دەرهەزار.

٣- سەمی برکۆتۆکس بە رادەی ١/٦٠٠ و....

**سەرنج :**

## سەرنج

لەکاتی دیتنی مەسموو- مییەتپاش سەمپاشی کردنی ئاژەڵ بۆ سارێژبوونەوەی ئاژەڵ لەدەرمانی سۆلفات (ئاترۆپین) بە رادەی قەلافەتی ئاژەڵەکە کەڵک وەرگرین

**کەریم قەیوومی**

هەبوو نەبوو ، زەمانی قەدیم پیاوێکی دەوڵەمەند و بە دڵ و دەروون تاقە کوڕێکی هەبوو. زۆری خۆش دەویست . هەر چی ویستبای بۆی جێ بە جێ دەکرد.

وای لێهات کوڕە گەورە بوو. دۆست و رەفیق دەورەیان دا . تووتنەکەی* خۆش بوو. شەو و رۆژ خەڵکی بەدواوە بوو . ئەویش بە تاشای* دڵی بۆی خەرج دەکردن و دەرخواردی دەدان . ئەوانیش رێچکەیان دەبەست و کاکە کاکەیان لێ دادەناوە . ئەگەر سەعاتێک دیار نەبا لە پشت دەرکەی ماڵەکەیان رێچکەیان دەبەست هەتا لە خەو هەڵدەستا .

بابی بەو حەیس و بەیسەی* دەزانی و دەیویست کارێکی وا بکا کوڕەکەی پەشیمان بێتەوە و دەست لەو رەفیقە خراپانە هەڵگرێ .

رۆژێکیان هەروا دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. بابە کوتی :

ـ رۆڵە ئەو هەموو رەفیقە چن لە دەورەت وەکۆ بوونەوە ؟ بۆچی دەبن ؟

ـ ئەی ! بابە ! چۆن شتی وا دەڵێی ! بەسەری تۆ دڵم دێشێ ها ! ئەوانە هەموو سوێند بەسەری من دەخۆن . بەخودا پێیان بڵێم بمرن دەمرن . بێ من قامک لە ئاو راناکەن .

باب کە دەیزانی کوڕەکەی ناحاڵی یە پێکەنی و گوتی :

ـ کوڕم بەسەری بابت ئەوانەی وەک شڵغە مێشی دەورەیان داوی رەفیقی خواردنن . جەمێک لێیان ببڕێ دەتۆرێن . دەڵێی نا با بەتاقی یان بکەینەوە .

ـ چۆن تاقی دەکرێنەوە .

ـ زۆر هاسانە کوڕم. خۆ ئەمن سەرم لە ئاشی سپی نەکردووە ، دنیام دیتووە ئەوشۆ پێت دەڵێم .

کوڕە هەتا شەوێ خۆی لە ژووری حەبس کرد و وەدەر نەکەوت . شەوێ بابی کاوڕە مێیەکی هێنا . سەری بڕی . لەت و کوتی کرد و دەتەلیسی راکرد. بە شانی کوڕەکەی دادا و گوتی :

ـ هەستە وەپێشم کەوە با بڕۆین

کوڕە کەلاکی بە شانی دادا و وەدەر، کەوتن . لە پێشەوە چوونە ماڵێ رەفیقە

خۆشەویستەکەی . لە دەرکەیان دا . کابرا
دەرکەی کردەوە و کوتی :
- چیە بەو نیوەشەوە. ڕۆژ قاتی
بوو ؟
کوڕە وەجواب هات و گوتی :
- وەڵڵاهی چت لێ بشارمەوە پەنام
بۆ هێناوی . ئەوە یەکم لە دەست* زایە
بووە .
- لە کوێ ؟... چۆن پیاوت کوشتووە ؟
- بەڵێ . وەرە مەردی خودابە ڕێیەکم
پێشان بدە با زوو بیشارمەوە دەنا ڕۆژ
هەڵێ لێم ئاشکرا دەبێ .
- بڕۆ ! بڕۆ ! پیاوکوژ . خۆ من
قەتم تۆ نەناسیوە. هەر ئێستا لەبەر

چاوم ون بە دەنا هاوار دەکەم دەر و
جیرانت وەسەر گەڕێ ... یاڵڵا .
ئەوەندەی گوت و دەرکەی پێوە دا و
چۆوە ژوور .
کوڕە چاوێکی لە بابی کرد . زۆر بە
خوێدا شکاوە . گوتی :
- قەیدی ناکا بابە گیان . وەرە
دەچینە لای دۆستەکانی دیکەم .

- باشە کوڕم . با بڕۆین .
سەرت نەیەشێنم . ئەوێ شەوێ تا
بەیانی لە دەرکەی ماڵێ هەموو دۆستە-
کانیدا بەڵام کەس وەخۆی نەکرد. ناعیلاج
و ناچار ڕووی لە بابی کرد و گوتی :
- بابە بەخودای ئەو ڕەفیقانەی من
هیچ نایەنن .
باب کە زانی کوڕەکەی ئاقڵ بووە گوتی:

- هەڵگرە با بڕۆین ئەمنیش کۆنە
دۆستێکم هەیە با ئەویش تاقی بکەینەوە
- بابە دۆستی تۆ کێیە !؟ ئەدی بۆ
تا ئێستا نەمدیوە .
کوڕم دۆست دەبێ دۆستی تێشکان و
لێقەومان بێ وەک تۆ دایم و سەعات
بەر دەرکە بە یەک ناگرین . جارێ
وەرە با بچین .
دیسان کوڕە کەلاکی بە شانیدادا و
وەدووی بابی کەوت . کەم ڕۆیشتن زۆر
ڕۆیشتن گەیشتنە ماڵێ دۆستی کابرا .
لە دەرکەیان دا . کابرا وەدەر کەوت
سڵاویان کرد. سڵاوی ئەستاندنەوە و لێی
نەپرسین بۆ هاتوون . وەپێش خۆی دان و

بردنی بۆ ژووریَ . خێزانی هەستاند نان
و چایەکی بۆ ساز کردن . دوای حەسانەوە
جا ئەوجار گوتی :

ـ دەی کاکە خێرە شکور بە سەرتان
کردووەمەوە .

ـ ئەوە یەکمان بەدەست زایە بووە .
دەمانەویَ بیشاریەوە .

ـ جا ئەدی بۆ بۆخۆت هێناوتە . لە
دووت ناردبام بۆخۆم دەهاتم دەمبرد .
دەی تازە کار لە کار ترازاوە. کوا ؟

ـ ئەوەتا لەت و پەتمان کردووە و
لەو تووورەکەمان ناوە

ـ جا دانیشن کارتان بەسەریەوە نەبیَ
ئەمن ئێستا دێمەوە .

کابرا میوانی بەجێ هێشت . تەلیسی
بە شانیدادا و مەلا بانگدانان وەدەر
کەوت . هەستا چوو کەلاکەکەی جێ بەجێ
کرد و گەڕاوە .

کوڕە هەر پێی سەیر بوو چۆن
ڕەفیقی واش هەیە ؟

نە نانی دەخوارد نە چا . ئاراو و
قاراوی لێ هەڵگیرابوو. بابی رووی تێکرد
و گوتی :

ـ ها ا کوڕم ، چۆنی ؟ ئەمن دەمکوت
ئەوانە ڕەفیقی نانین ئەمنت پێ شێت
بوو .

ـ بابە وەڵڵاهی نەمزانی . شەرت بێ
لەوە بەولا دۆستی وا بگرم وەک دۆستە-
کەی تۆ بێ .

ـ کوڕم ئەوەت لە بابی خۆت وەسێت
بێ دۆستێکی بەراستی لە هەزاری بە
قەستی چاترە .

لەو قسانەدا بوون کابرا گەڕاوە
گوتی :

ـ خاترجەم بن . بە ئاوم دادا . گوتم
نەوەک ژێر عەرزی بکەم دوایە بە
بۆگەنیرا خەڵک پێ بزانن .

هەستان وەدەر کەوتن . کوڕە بە دووی
بابیدا بەرەو ماڵ بووە. بۆ بەیانی
باب شکایەتی لە دۆستەکەی کرد و چون
پێی قەرزدار بوو لە بەندی کرد.

کوڕە زۆری پێ سەیر بوو گوتی :

ـ بابە گیان ئەو دۆستە خۆشەویستەت
بۆ بەگرتن دا ؟

ـ راوەستە کوڕم جارێ زۆرت ماوە !

دوو ڕۆژ پێ چوو . بابە بە کوڕەی گوت :

ـ هەستە با بچین سەرێک لەو دۆستەم بدەین .

ـ با بڕۆین

هەستان چوونە مەحکەمە و سەری دۆستەکەیان دا . دوای چاک و خۆشی کابرا گوتی :

بکەن و کابرا رزگاری بێ . هەر کە وەژوور کەوتن . کوڕە دیتی دۆستەکانی پێشووی سێ چوارێک ئەوە لە مەحکەمەن تێکرا کوتیان :

ـ ئەوەتا ! ئەوەیە ! شەوێ پیاوێکی کوشت . ئێمە بۆ خۆمان دیتمان لەت و کوتی کردبوو و بە شانیدادا دابوو . کابرا لەسەرەخۆ وەقسە هات و نەقڵە

ـ کەی گێڕاوە .

ـ کاکە هیچ قەیدی ناکا . حیساب حیسابە ! بە گرتنت داوم هەقی خۆتە ئەمما هیچ نیگەران مەبە قسەی خۆمان لەبیر خۆمان . باسی رووداوەکە ناکەم .

کوڕە زۆری پێ سەیر بوو . هەر لەبەرە خۆیەوە دەیگوت :

ـ کوڕە چۆن دۆستی واش هەیە ؟

هەستان باب و کوڕ ، کابرایان بەجێ هێشت و چوونە مەحکەمە تا قازی حاڵی

دۆستەکەی رزگاری هات و ئەویشیان حاڵی کرد . کوڕە دۆستەکانی وەلا نا و بە حەیا و بە ئەدەب خەریکی کار و کاسبی خۆی بوو .

ئەمنیش هاتمەوە لەو لا را
کاڵەم دڕا و چم پێ نەبڕا

## بەرەو:

# زمانی یەکگرتوو

زۆر لەمێژە کورد هەستی بەمە کردووە کە پێویستی بە زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی هەیە و دەبێ ئەم زمانە بۆ سەرانسەری کوردستانی دابین بکا. ئەم هەستە لە یەکەمین کۆنگرەی فەرهەنگ وئەدەبی کوردیدا کە لە لایەن ئەم ناوەندەوە پێک هات دەنگی دایەوە و بەشی زۆری وەختی هاوبەشانی کۆنگرەی گرت . لە کۆنگرەدا پاش وت وویژ وراوێژی زۆر بڕیار درا هەتا زمانی یەکگرتوو پێک دێ نووسەران و زمانەوانان حەول بدەن لە لەهجەکانی کوردی کەلک وەربگرن وئەم زمانەی پێ دەولە-مەندتر بکەن. هەروەها گۆواری سروە وەک نموونەی زمانی یەکگرتوو پەسندکرا و قەرار درا رێبازی ئەم گۆوارە لەباری [illegible]نووس و شێوە زمانەوە لە هەموو ناوچەیەکی وڵات رەچاو بکرێ .

بەختەوەرانە تا ئیمڕۆ گۆواری سروە جێگەی تایبەتی خۆی لەنێو دڵی ئەدیب و رووناکبیر وهەموو چین و توێژەکانی خەڵکدا کردۆتەوە. سروە لە هەموو ناوچەکانی کوردستان داخوازی هەیە ولە دەرەوەش جێی خۆی کردۆتەوە .

ئێستا دەزانین " سروە" وەک هەڵگری فەرهەنگ وئەدەبی کورد و بووژێنەرەوەی زمان وفەرهەنگ و ئەدەب دەورێکی بەرچاوی بەستۆیە بۆیە بە پێویستمان زانی لەمەودوا هەشت لاپەرە بۆ لەهجەکانی دیکەی زمانی کوردی بکەینەوە مەبەستمان لەم کارە ئەوەیە :

– کوردی خوێندەواری ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان بە لەهجەی ناوچەکانی دیکە شارەزا بن وتکامان لە هەموو خوێنەرانی بەرێزی سروە ئەوەیە کە زۆر بە سەرنجەوە ئەم بەشە بخوێننەوە و هەڵی نەبوێرن . دڵنیاین بەم کارە تێدەگەن کە زمانی کوردی لەپنج و ریشەدا یەکە و شێوە ئاخاوتنە کە جیاوازی پێک دێنێ .

جا مەبەستمان ئەوەیە خەڵک بە هەموو لەهجەکان شارەزا بن و وشە وزاراوەی هەموان هەڵسەنگێنن وئەوی هەرەباش وبەجێ ولەزاران خۆش بۆ زمانی ئەدەبی کوردی هەڵبژێرن .

ئەم کارە دەبێتە هۆی لەبەریەک رانانی وشە وزاراوەی لەهجەکانی دیکە و دیتنەوەی کەوشەنی جیاوازیان و لە ئاکامدا بەرەویەکدی بردنیان .

کەوابوو داوا لە هەموو زانا و ئەدەبدۆست وقەڵەم بەدەستی کورد دەکەین لەم بارەوە سروە یارمەتی بدەن وبابەت و نووسراوە بە هەموو لەهجەکانی کوردی بۆ ئەم ناوەندە بەرێ بکەن تا لەم پێیەدا کەلکیان لێ وەربگرین و بە هەموان هەنگاوێکی بەکەلک بۆ زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی هەڵێننەوە .

لە رەخنە وپێشنیاری هەموو ئازیزانی خاوەنرا بۆ باشتر بەڕێوە بردنی ئەم ئەرکە و گەیشتن بەم ئامانجە پێشوازی دەکەین .

دەستەی نووسەرانی "سروە"

ل پشکا زۆره کتێب وپەرتووکێد کول بارا کوردوکوردستانێ دا هاتنه نڤیسین، کێم وزێدە ئەمراستی گۆتەیا "**کورمانج**" ژ تێن ودبینن کو ئەڤ گۆتەیا هەمیشە دگەل گۆتەیا "**کورد**" بوویه ومەعنیا وان هەر دوو گۆتەیا ژ هەیێک بوویه.

لێ بڕەک ژمێژوونڤیسا ل بارا رەهـ وریشا گۆتەیا "کورمانج"دا کەتنه شک وگومانێ وهەریەکێ ژ گۆرەکی بیرورا و هندی زانین وئاگاداری یاخوه ل باراڤێ گۆتەیێ دائاختنه.

ژان دومورگان مێژوونا سێ فەرانسەوی ل باراگۆتەیا "کورمانج"دا نڤیسیه: "ئەز نزانم بنێشەیاڤی گۆتەیێ ل کیدەرێ راهاتیيه. گەلۆ ئەڤ گۆتەیا تێکەل بوویي یا گۆتەیا "کورد"ه ، یان ناڤی هۆزەک مادی ل کوردستانێ دابوویه."

پرۆفسور مینورسکی رۆژهەلاتناسێ ئووڕسیتێ دنڤیسه : "کورمانج ژدوگۆتەیا پێک هاتیيه. پیتا "چ"یا دوایێ ژ پاشگره، کودەبێ ژێجودا به، دمینەدوپشکێ دی یەڤێ گۆتەیێ پشکایەکی "کور" کوکورت بوویي یا گۆتەیا کورد ه پشکا دوویێ ژی "مان" کو ئەوژی کورت بوویي یا گۆتەیا "مانای"یه. بڤی جوری گۆتەیا "کورمانج" دبه کوردێ مانایی.

تەوفیق وەهەبی ل پرتووکا "بنەچەکەی کوردان وبنچینەی زمانی کوردی "دا دنڤیسه: "ئەزبرۆناهی نزانم کەنگێ ناڤێ"کورمانج" پەیدا بوویه ،لێ پشکەک ل، کوردان کو کوچەرو رەوەند نەبوونه ول گوندا دامانەو وەرزگاری کرنه ،ژ خوه را کورمانج گۆتنه ."

رەحمەتیێ **ئیحسان نووری پاشا** ل پرتووکا (تاریخ ریشهٔ نژادی کرد) کوبفارسی نڤیسیيه، دبێژه: "کوردێد لایێ شاپوورورزایێ( سەلماس و ئورمییێ) ئەوانێ کو عەشیرەتن ول رێگا تەرشداریێ دژین دبێژنه خو" کورد"لێ ئەوانێ کو گوندینه ول رێکا وەرزگاریێ دژین دبێژنه خو" کورمانج" هەلبەت هەردو دەستەژی خوکورد دزانن و کوردی ژی قسەدکن ودەب ورەسم وری وشوونێ ژیناوان ژی هەوەکی هەڤه ."

رەشیدیاسەمی ژیل کتێبا ( کوردوپیوستگی نژادی و تاریخی او)دنڤیسه : "ریچ" ل بارا کوردان دا دبێژه کو کورد دودەستەبوونه :دەستەیەککوچەر بوونه کوکارێ وان تەرشداری بوویه وگۆتنه وان "ئاسیرتا" دەستادی ژی ، گوندی و وەرزگار بوونه کوژوان را " گۆران"گۆتنه .

تیبینی: گوتەیا "ئاسیرتا" دقەومەهەمەن گۆتەیا"ئازینتا " یان "ئازینته" به ، کول زمانێ کورمانجی دایانێ وێلگەرو گەرۆک . کەسێ کو بێچنه دگەره .

لێ ئەحمەدێ خانی شاعرێ بلندپایه ودلسۆژه کورد، ل دەستپێکا پرتووکا مەموزین دەماکو لبارا کوردان و ، مێرخاسی یاواندا دبێژه و دبلینه، چ جودایی‌وجیاوازی یێ دانانه نیڤەکادو گۆتەیێ "کورد"و" کورمانج". ڤان هەر دووگۆتەیا ژی دگەل هەڤ ب مەعنییەکی بکاردبەودبێژه :

**داخەلق نەبێژتن کوئەکراد**
**بێ مەعریفەتن بێ‌ئەسل وبونیاد**
**ئەنواعێ مللەل خودان کتێبن**
**کورمانج تەنێ دبێ حسێبن**
**کورمانج نەپڕ دبێ کەمالن**
**ئەمما دیەتیم وبێ مەجالن**
**بفکرژعەرەب حەتاڤەگورجان**

**کورمانج چ بوویەشوبهی بورجان**

تاڤیرە مەبزمانێ پێشی یا ئاخفت. ئیجا یا باش ئەوەکو ئەمخوژی سەرەکی ل کوردستا- نێ بدن وبزانن کانێ کورمانج کینە؟

ل ناڤچا موکریان بگشتی ناڤ کوردێد سۆرانیدا دبێژنە گوندی ووەرزگارا "کورمانج" هەیلۆهندەک ئەڤی گۆتەیێ دقۆرتسینن و "کرماج" ژی دبێژن.

پشکا زۆرە کوردێد کوردستانا تورکیایێ هە ژخوەرا "کورمانج" دبێژن و چ جودایی و جیاوازی یێ ل نیڤەکا دووگۆتەیێد کوردو کورمانج دانزانن. کوردێد خوراسانێ چ گوندی وبا ژێری چ کۆچەرورەوەند هەموو هەخوکورمانج دزانن. ئەڤانە بزاراڤێ کورمانجیا ژۆرین قسەدکن.

کوردێد لایێ ماکووخۆیێ ژی خوەرا کورمانج دبێژن ئەوانا ژی بینانی کوردێد تورکیایێ چ فەرق وجودایێ ناکەنە نیڤەکا گۆتەیێ کوردو کورمانج.

ئەمما لناڤ کوردێدسەلماس وئورمییێ (شاپوورورزاینێ) بتایبەت لناڤ هوزێد شکاک دری ـ بەگزادە ـ هەرکی گۆتەیا کورمانج رەنگ ورروویێ خویەبنێشەیی ومێژوویی، ب باشی نیشان ددە. ڤێدەرێ ژ کەسانێ کوعەشیرەت نینن وسەرچ هۆزوتایفێد کۆچەرو تەرشدار نایێنەهەژمارێ و شۆل وکارێ وانە بنێشەیی وەرزگارییە وهەمێشە ل گوندادا دژین "کورمانج"دبێژن. هەرچەند کو کورمانجێد کوردستانا تورکیایێ وکورما- نجێد لایێ خۆو ماکوویێ عەشیرەتن وخودانێ هۆزو تایفانە وشۆلا پشکا زۆرە وان ژی تەرشدارییە، لێ"کورمانجێ" ئورمییەوسەلماسێ گوندینەو وەرزگار، ل سەرچ هۆزوتایفێ ژی نایێنە ژمارێ. ڤێدەرێ کورمانج گۆتەیەک زۆرسڤکە. چون کورمانجێ ئۆرمییە وسەلماسێ عەشیرەت وتایفەبازی یێ ناکن،ژلایێ هۆزو عەشیرەتێد دی دادکەڤن ژێرزۆروزولمێ. ئەزمانێ کورمانجێ ئۆرمییە وسەلماسێ پاقشترین وبەرفرەترین زاراڤێ کوردی یەوتێکەلی یا دیترزمانا تێدا زۆرزۆرکێمە.

بهە جورەیی نهەپشکا زۆرە کوردێددونیایێ را چ عەشیرەت وکوچەر بن،چ گوندی ووەرزگار بن، کورمانج دبێژن ئەمدشێن بێژن کو کورمانج بینانی دارەکییەکوهۆزو تایفێد جوربەجورەکورد وەکی پەلک وچقێ وی دارێپەڕقەدانە وژەڤ زێدەبوونە.

بڤی جوڕەیی رۆن و ئەشکە- رەدبە کو کورد وکورمانجهە مللەتەکە. هەرتنێ چاوانییا کاروبارێ ژینێ ناڤێ وان لێک جوداکرییە. ئەوانێ کو ل گوندا دامانەو وەرزگاریکرنە "کورمانج"لی ئەوانێکو تەرشداری کرنەوکۆچەرورەوەند بوونە" کورد" یان ژیبگۆتنا "ریچ"،"ئاسیرتا" یان "ئازینتا" بوونە،فەرهەنگا موعین ژێرناڤێ کورد دا، دنڤیسە: شڤان،پەزدار،کۆچەر. ئەولێ زێدەدکە ودنڤیسەکو ئیرانی یێد بەرێ فارسێ دیلەمێ را کوردێتەبەرستانێ، عەرەبارا ژی کوردێ، سوورستانێ دگۆتن.

ئەمما ئەمبزانن کانی گوتەیا "کورمانج" چاوا پەیدا بوویە وچییە ویانێ چ؟ گۆتەیا "کورمانج"بگشتی ژسێ پشکا سەراست بوویە:

(کور + مان + ج) "کور" کورت بوویی یا "کورد" ە، "مان" یانێ مایین وروونشتن "ج" ژی یانێ "جی،جێ، جیهـ ج" کوبەمەعنییا جی ومەکانە سەرڤێ ڤەڕاندنێ "کورمانج" یانێ "کوردێ مانجی" کوردێ کو ل جییەکی دامایەوکۆچەرو رەوەند نینە. شرۆڤەکرنێد ژورینژی نیشان ددن کو، "کورمانج" وەرزگاربوونەول گوندا دا شۆلا جۆتکاریو وەرزگاری یێ کرنەخازی کورد هەمووژی کورمانج بمانا و ل سەر دەستە وهۆزوقەبیلا چقـ چقی نەبانا وهەرچاوا مللەتە ـ کی تەکووزە ویەکدەستن، یەکدست وتەکووز ژی بمانا.

كافى رێبوار بينايە سەر رێنڤيسا كوردى ...

ئاخين كەتبوو مێشە. سەقەما بايێ پاييزێ و نێچيرڤانێد بێ رەحم ڤرتژى ببوون. بايێ پاييزێ يێ سار مێنا خەزەڤى دفيتاند. ژ هێوڕزا بێ، بەلگێد دارا ئێدى بەد رەنگ دلەرزين. تەيێ بگۆتا ب دلشەوات ،دلوڤاندن ،بێتاقەت دبوون و دوەشيانە عەردێ. جى جى يا گورينييا تڤنگێد نێچيرڤانا بوو و دكەتە مێشە و دبوو گوژين ودەنگێ هەر گوللەكى راقەى بێ مێشە دنەعلييا.

راستى ژى نەعلينا وێ بوو.

رۆژێد وى يە گەش ئوندا دبوون، خەملا وێ يە خشيم دخەيرى، خەزالێد وێ يە بەدەو دهاتنە زێراندنێ وقرِ كرنێ وئەوێ دكرە ئاخين .نە ئاخر ئەوژى تێدەردخە، نە ئاخر ڤراژى روح، كۆل ودەرد هەنە. ئاها ڤورف كەتييە دلێ خانما مێشە. ئەو ژ گوللا نێچيرڤان بريندار كەتييە و رەڤييە و نەوالەكێدا كەتييە. ژ برينا گوللێ خوون دكشە. ب چەعڤێ خوە دبينە، وان گوهاستنێد نە-بينايى تەغمين دكە كو ناڤا وێ دا پێشدا تێن. دۆربەرێ وێ ژى تێنە گوهاستنێ ،ئەو خوەخوە ژى نە ئەوە. چكو ڤێ سڤى بوو..لێ ئەڤ چ عەجێبە چما ئەو ديسا بينا بەرێ نينە، چما ئێدى نكارە سەر پييا بسەكنە، برەڤە....

حێزى يا ددەخوە، دچرچرە، دچر-چرە، دخازە پێ بخەسە لێ ئاخر چاوا قەومى، چ بوو؟... و هەمانكێ تێ بيرێ وەكى تەڤى كارا خوە دچێرييا... نشكێڤا تشتەك تەقييا.. گەرمايكێ گرتێ و كەت .... پێرا پێراژى رابوو....

كارڤا وێ يە بەدەو..لێ ئێدى نايێ بيرێ ،هەر تشت لەڤ كەت تاقەت نەكر....

ئەوێ تێ دەرخست ،وەكى ژ تێبوونا دلێ وى دشەوتە... دەست خوەدا جەوا ئاڤا بنتارا گێلى كەتە بيرى ،دەنگێ خولە خولا ئاڤا زەلال هاتێ ،ئەو رۆژێد هێنكە خوەش كو ناڤا مێشەدا دەرباز كرييە ،ئەو لەيلانا نوورا بەربانگێ هاتنە بيرێ. وەختا ئەو سەرخوە بوو، سڤك سڤك دا-دكەتە وى گەلى يێ ژێرێ وتێر تێر ئاڤا سار ڤەدخار... نهاژى دخوەزە، لێ يازخ ،دك نەدكر نكار بوو

رابینیا .... هەر جارنا کو حێز ددا
خوە وەکی رابە دبوو شەلپینا وێ
دکەت ناڤا خوونا مەوجی وژ برینا
گوللێ دیسا خوون دهات . پاشێ
خوون کێم بوو. برینا گوللێ ژی
ئێدی ئەو مینا بەرێ نەدئێشاند:

هێنژی ،تەخمین کر خەواوێ تێ :
هەر چار ئالی یێ وێ تەعری کەتە
عەردێ و بەرە بەرە هەر تشت بەر
چەعڤێ وێ رەش دبوو.

رۆ دچوو ئاڤا ، پەنجێد تەعڤێ
پش چی یێ دا ئوندا دبوون ،دەنگ
و حس ژ مێشە هاتنە برینی .

سورا ئێڤارێ دەست پێ بوو .
خەزال سەر هشێ خوە داهات، ب حەژ
بینا تەمز کشاند. چەعڤێد خویە
ترسیایی ڤەکرن ،ژۆرێ ستەیرل
عەسمان دچوورسین ،تێدەرخست وەکی
شەڤە. قەواتا خوەیە کو تاسی یێ
بەر ڤ کر ، تاقەت دا خوە
جی لەقیپیا ، چۆک ژی راست کرن و
دیسا کەت ،کوورکرە زارین ، ئەوێ
زارینا خوە بهیست و ئەو دەنگێ
کوتاسی یێ بوو کو ئەوێ ڤێ دنێ دا
بهیست .

ئەحمەدا چاڤێ تە مازاغلبەسەر
یەک ئشارەتا تە ئینشەققەلقەمەر

حوکمێ تە جاری ژ عەرشێ تابفەرش
ئەی ژ نوورا تە موننەوەر تابعەرش

ئاتەشێ مووسا چ بوو روخسارێ تە
وەززوحا نوورا دلێ هوشیارێ تە

دورر نوورا تە زیبایێ مێهر وماه
لی مەعەللاهیلجەلیلێ بارگاه

نی ژ نەعلەیناتە ئەی دوررایەتیم
فەخرو تەشریفە ژ بۆ عەرشێ عەزیم

هەر دوو عالەم چ سیها ئێقبالێ تە
سووندا وەللەیلێ بزولف وخالێ تە

هەمتورووح و هەم رەوانی جان ودل
پێش بەژنا تە سیهاکولل بوون خەجل

جانفدایێ بەژن وبالایێ تەمە
مەست وسەرگەردانێ سیمایێ تەمە

شەهسەوارێ دولدولێ کەون ومەکان
واسلێ وەحدەت سەرایێ لامەکان

من هەبن سێ سەدهەزار ئەزمان ودەڤ
یەک دەمێ غافل نەمینم رۆژو شەڤ

وەسفێ حوسنا تە ببێژم سوبح وشام
سەد قیامەت دێ بچن هێژ ناتەمام

یارەسوولەللاه رەسوولێ ئێنس وجن
یا شەفیعێ سەدرێ ئەیوانا مەزن
تو شەفاعەتکە ژ یۆمە عاسی یان
وەرنە نەفسا شوومناکەت قەنجی یان

# ئەنجوومەنی ئەدبی ؟! ٥٥

ف. شیخەلیسلامی

نەمزانی کێ ئەم **تۆمە لەقیە لە دەممانا شکاند**. کام لەخوا نەترس ئەوەڵ دەفعە وتی :

"جەمەو بینۆ، دانیشین ئەنجومەن دروس کەین ."

خاس نایەتەو بیرم. ئاخر خۆمانین من چەو ئەنجومەن چە؟! وەک تارمایی تێتەو بیرم. چونکە ئەو شەوەو شەوگەل تر تامەلا بانگدان دانیشتین و قسەمان کرد.

" ئەگەر بێژم قسەیان کرد دروس ترە" ئەوێژیا :

" ئێمە ئەوەینە وا سەلاحەدینمان بوو. ئێمە رۆلەی کاوەین .ئێمە زوان و چاوو فکرمان هەس...."

وەلێ ئێوەش بیگانە نین .فرەتر زوانمان بوو. ئاقیبەت دوای **کتێب خوێنی** و وت ووێژو راورێوی گەین بەیرە وا ئێستە هاین تیا. **رمڵ خراو مەپێکن**. گشتی سالێکە. بەلێ ئەگەر تەحتیلی وچتحەساو نەکەین ساڵەوەختێکە خەریک دامەزرانی ئەنجومەن فەرهەنگین بۆ شارەکەمان ئیشاڵڵا بوێتە ئەسپاو خەیر. بەگیان ئێوە ئیسەیچە قورگم هەر بۆئەوە ئەیشێ.

دوێ شەو تازەترین کۆبوونەوەمان لەماڵ کاکە ئێرجا بوو .ماڵی نەشێوگێ بەراسێ هەم ئەدیبە، هەم شاعیرە. ( جاچوزانم ئەدیب و شاعیر فەرقیان چەس! ) هەممەیمان نەوازە، ئاغە یەک کەلام پیاگە. ئاگرە، شەوقە، بەسەزوان حەڵەبی سازە. دووکانەکەیچی ها لەژێر ماڵەکان خوەیانا لەسەر تەپۆڵا. خوەی تاریف ئەکا :

" شیعر و شاعیری کالاێکە بە بالای ئەوانوو بنەماڵەیان برِیاگە. ئەتانم بێژم بە شیعرگۆچ **کریاگە** خوا بیوەخشێ دایکی **بەرتەو تانەی** خاسی ئەزانی. ئەوسا ماڵیان لە قەتارچیانا بوو. دەوری شاریوەر ساڵ گرانیەکە هەرکەیانبردایتە ئیجباری ژنیان بۆ کەس بهاوردایێ، کەنیشکیان بدایتە شوو، دوور لە رووتان کەسێ بمردایەت خولاسە بۆ هەچی چتە شیعرێکی ئەوت . جاوا بە سۆزەو ئەی خوەندەو پیاگ حەزی ئەکرد دانیشێ وتێرو پڕ با لە پرمەی گریان .

ئاغەی کەتۆ بی کاکە ئێرج کوڕ وەها ژنی بوو. ئەیان وت تا پەنج، شەش ساڵ لەمەوبەر لە بان ئاوپاش ومەنگەڵ ومەجمعەی حەلەبی وهەرچێکەو درووسی ئەکرد. بەیتێ دوان لە کارەکانی هەڵ ئەکەند و ئەیانیدا بە خەڵک بەمفتە پوولیچی نائەسەندو ئەیوت : " هونەر ئەشێ بچێتە ناو مەردوم! "

**هەرکە لە قەور خۆیا ئەنرگێ** . بەعزێ ئەیانکردە جواو ؛ حەتا لەبان لوولە ئافتاوەو غەزەلی دەرئە- هاورد !

کارەکانی مەنشوور خاس و عام بوو. وەک توحفە و تەوەڕوک ئەیان برد بۆ ئەملاو ئەولا. چڵک کەس ناشۆرم وەلی بەم گوێچکە گەل خوەم ژنەفتم **جار وا هەس حەق "تایی" لە "دۆڵاوی" ئەسێنێتەوا!** بۆ نموونە فلان تەشت وتاوەوکەرەنای حەڵەبی ئەوەخشێ بۆ گەشە پێدان فەرهەنگ و هونەر

( ئەڵبەتە سەنعەتیچ)وەلێ لەباتی تاوڵەمەیک ئاتە کوڵێ پووڵ بەفلان " تازە پیاکەفتگ " نیمە فەرەنگی نیمە فەرهەنگی !

ئەی هاوار قوڕگم . خاسیەکەی ها لە وا ئەم قوڕگ ئێشە ئەمخاتەو فکر ئەوە. گەرەکم بوو بێژم چە. ئەرێ لەدوێ شەوا بووین خانەی ئاوا تەک ئیوەئا . کا ئێرج بامیە وزلووبیای فرەیکی سەند وئاغە چایە خاسەکەو روتەب تازە و مەیمانەکانیچ بە درۆ یا بە راس بەربانگیان لەینا کردەوەو هەر وەک باقی شەوگەل میرزا ئەحمە و مژێ قورسی دا لەسگارەکەی و دوای قورقێنەی زل دوو شاخە دووکەڵی لەدوو کونای لووتیەوە وەک لوولەسۆمپا دا دەرەوەو وتی :

" شاعیر و نووسەرە عەزیزەکان ! ئەدیب و لێزانە بەرێزەکان ....

قورقێنەی تر قسەکەی بڕی .

" .... بەلێ براگەل ئیمشەو لەیرا دانیشتگین تا بۆ تەغیر ئیلاهی ئاخرین راوێژگەل خوەمان بکەین و ئیشاڵڵا لە رۆژ جەژن رەمەزانا ئەنجومەن فەرهە ـ نگیەکەمان ئفتتاح کەین . جا لەودوا ...."

ناخافڵانە ئاغەی "چەن کارە" کە هەم کارمەند بوو، هەم بووتیکدار وهەم قاعیدەتەن شاعیرو ئەدیب دەست راستی بەرزەو کرد بامیەکی هەڵخست و وەک کەڵەشاخ بگرێ ،مژێ وای دا لە سیگارەکەی گەیاندیە فیلتەر وبۆ ئەوەی پرسێ بە کەس بکا وتی :

" من موخالفم.خوایشوو لێ ئەکەم ئامیرزا ئەحمەو **بە هەر رەنگێکی ئەکەی بە گوڵ خاری مەکە**، خۆخومخانە نیە بێژەنی پیاو دەری بێرێ. بیلاتەژبی کار ئەشی بەدەس کارزانەو بێ. من خوەتان ئەزانن ئاونە مناڵ بووگم(دەسی کردەوە و بنگووسێکی نیشان دا) ناو کتێب وفەرهەنگ و کاغەز و پووشا گەورە بووگم. ئەم **مووگەلیچم لە ئاسیاوا چەرموگ نەکردگە.** ( ئێوە مووی چەرموگتان لە سەریا دی من نەمدی ! بۆ ی پاڵێت حەفت گیا " موعجزە ئەکا!) ئەوەسە بە نەزەر من ئەوەڵ ئەشی رەیسی سنی بۆ ئەنجومەنەکەدانێن لەودوا ئەعزا جیاکەینەوە ئەڵبەت **نان بە کەس نامە قەرز**.خوەیچم ئیسرارم لێ مەکەن کە بە گیان کوڕم حەز ناکەم رووتان بەمە زەوینا وەلێ بەو بۆئەوە ئەنجومەنەکەمان لە نەزەر مادی ومەعنوی ویەوە بکەفێتە بەرەو. زوانە شیرینەکەمان بەقەوڵ شاعیر وتەنی وەک قەن پارسی بیوەنە بەنگالەوبێرینیەو !! داواتان لێ ئەکەم جەناب "نووربازار" بە عنوان رەیس ونازز و هەمەکارە ئینتخاب کەین و خەیاڵ خوەمان رەحەت کەین .... لەبیرمان نەچێتەو ناوێ وەک مناڵ باوەژندار بکەفینە ژێر چەپوک "سروە" و ئام چت گەلە. ئەڵبەت ...."

میرزا حەسەن وەها بیسمیلایەکی کرد. گشتمان داچڵەکیاین. وەمان زانی جنۆکەیێ چتێ هاتگە! وتی::

ئافەرم سەدئافەرم"چەند کارە"

ئیمە زین وشیعر ئەسپ وچەندکارە" شاسوارە"

ناتانم بێژم شاعیرم! وەلێ منیچ بە قەوڵ " چەندکارە"ی عزیز منیچ ناو مقەوا وکاغەز وقەڵەم و جەوهەرا گەورە بووگم. فەرمایشەکان چەند کارەیچ گشتی قسەس و بە جێگە. وەلی وەک مناڵێ زۆری بۆبێ ونەتوانێ بەرنەفس خوەی بگرێ مەجبوورم لە تەئکید فەرمایشەکانیانا عەرز کەم ئێمە **بنکرخۆر نین** .ئێمە ئەشێ لەژێر چەپۆک "سروە" سەهنە نەوسین تەسلیم شەماڵ و زەلانیچ نەوین ! وەلێ بە شەرتەها وشرووتەها ! ئەو

ئاغه گەلە هاتنە ئەم شارە ووتیان ئەنجومەن دامەزرنن وەیان ئەزانی ئێمە هەتیم و سەخیرو.... خەیاڵ خاوا ئەوەسە ئەشێ لە ئەوڵین شومارەی مەجەلەی ئۆرگان ئەنجومەنەکەمانا ئەم مەسەلە رۆشنەو کەینەو مەگەر خوەمان چەمانە باوکم **قسەیکیچ بکەن بۆ دزا** هەر ئێستە لەم جەمعا تا چاو کار ئەکات شاعیرو رەوشەن فیکر وئەدیب و عالم ، نووسەرمان هەسن . ماشەڵلا! جا تۆخوا حەیف نیە ئاغە لە رێگەو نەگەیگە بەرەو رێگە بنێتە بەرپای ئێمە " بشکێ ئەوپا وا ناچێتە کەوش خوەیا! " فشارخوێن میرزا حەسەن بەراستی چووە بان . بەرمان نەگرتایێ کارێکی ئەدا دەسمانەو.وتم قوربان تاوێ ئیجازە بەن چتێ عەرزکەم !

جواوی نەداوە، دەوری، گرتوو، وای ئەزانی خەریک نوتق ئینتیخاباتیە ! بە دەنگی بەرزتر لە ئەوەل وتی :

" جواوم بەنەوا برا گەل کڵاو نەچێتە سەرتان! سەور ئەکەین تا کارەکە بیگرێ ."

دەنگی نزم کردەوە بە پچە وتی :

" هەر گرتی باوک من باوک "سروە"ی نەدیگە. **مسەمسی بۆچەس مسەفای رووتی** ! وەک یارۆ وتەنی " **شەر لە شێفا وئاشتی لە خەرمانا** "سۆزی نەکەنە کاری بوینە تانەی دۆس و دژمەن.ئاغەگەلیچ **شاکامیمان پێ بێژن** ! جاشتێ گەرەکمە بێژم من حەتا ئەگەر بمکەنە عزوی سادەی ئەسڵی یا عەلەلبەدەڵ فەرقم بۆ ناکا. بە قەوڵ حافز:

" مشک آن است کەخود بگوید، نە آنکە خودنگویدا"

من ئیتر قسەیکم نیە .

هێشتا قسەکە لە دەمی نەوریاو زلووبیای گەورەی تەپاندە دەمی وپاڵی داوە! چاو چاوی نادی! دووکەڵ سگار و بۆی پاوقورقێنەی پیاز وئاوگوشت "حەتمەن هین پارشێو" تەنگەنەفەسمی کرد و هیلاک بووم !

تفم بەزۆر قووت ئەدا بیلاتەژبی هاتووە وەیەک . دوارە دمم هەڵمژی . وەک ئێوەش برامن کەسی **بێزگ کات** لچکەگەلم جەمەو بوونەو، قوتەو بوونەو. چوونەویەک وەلێ قووت نەدریا ! ئاخ برا رۆ ناچێتە خوارەو. شایەت هین ئەو دوو پدلە شنگە بووێت وا لەماڵە کاکەما خواردم.ئای ئای ئەوانیچ خۆ عەمەر درێژ بن هەر وتیان بەهارە لەشنگ ورێواس و بەنا و گێلاخە وپاڵمە و هەمەگیا ، سەری تێ ئەکەن براژنم وا ئەیان هارێ ئەیژیتە لەبەرپەوە **هاتگە.** ئەیوت ئابرا !

- (بەمن ئیژی ئابرا)، تۆ هەزار ساڵە بی.دایکم وەسیەتی پێم کرد شنگ یا بەخاو یا بەسرکەو بخوەن ئەویچ کەمێ بۆدیان خراوە ناو سک پاک ئەکاتەوە.

وەلێ لەجیای رێواس بۆ دیان خاسە وبۆ ناو سک خراو. خۆلاسە هەروا کەقسە ئەکا **ئەی ماڵێ وئەیهارێ.**

ئەی هاوار ناچێتە خوارەوا ئەیژیتە تۆڵاشەس ! خوناق بگرن لەداخا وامە پێهات . شنگ چە و چت چە ! ئەمەسە ئەیژن "**بە کەر ناوێرێ بەکۆپان شێرە** ! "

ماسیم. دیقمکرد نازانم چ سرێکە لەم شارە بوزورگ و عەزیما کە بەقەو جەیحوونێک ئەوێ ، عەتار بە دوو بەیتی جواوت ئاتەو. خەیات وەختی ناو شان و ئەنازە ئەگرێ غەزەلت بۆ ئەخوێنێ. پارچە فرۆشدوو گەز پارچەت بۆ دائەدرێ لەجیای کاغەز کادۆ میراتیەکەتی تیا بپێچیتەوە ئەی نێتە ناو کوتێ کاغەز کایەشرە! بۆچە؟ ئاخرغەزەلی تازەی خۆی تیا نووسیگە. وایچ چاو ئەورێتە ناو چاوت تا زات ئەکەی بێژی بوەخشە گەزی چەنێکت حەساو

کرد؟

داماگین بەخوا،بەوبە ـ
ختین .دایک منالەکان بۆ
عەیوی یە. لەو جەژنـــەو
ڕکی کردە وکولەم گەرەکـە.
وتم ئاخر دایک خاس باوک
خاس .خۆ کوڕ**حاجی نەعمان**
**نیم**،سالێ **کەوا و کولەیکت**
بۆ بکەم! کردیە جواو:

" خوا لایق دیگ بەختیان
بەو بووە و منیچ بەختم
بوو بەمەو.خواو حەزرەت
عەباس بوونە بایس ئـەو
کەسە وامنیان نیاوا بـۆ
تۆ! غەوس بیکا ئـەویچـە
منی دایە تۆ **هەر شـەوێ**
**قەورێ بناسێ!** ،ئەی چۆن تا
شووم پێت نەکردوو **هەشـت**
**هەشتو** ئەگوت ؟ وەلـــێ
ئیسە داوای کراس ئەکـەم
نیە! کەوا نیە! کولە نیە؟
واتە ئەزانی**چاوت چەرمـگ**
**بوایێ** ژنت نەهاوردایێ !"

چەی پێ بێژم ئێـــوە
بواین چەتان ئەکرد؟ئاسمان
بەرز و زەوین سەخت .لـە
حێوەتا دوو سێ شیعری بۆ
ئەخوێنمەوە لە قەناعەتا.
وا مـۆڕم لێ ئەداتـەو
ئەیژیتە داوای ئیرسم لێ
ئەکا! لەحورسان دیانگەلی
ئەگیرنێتەیەکا. ئـەکاتـە
جواو."بیوڕەوەو نە تاقـەت
نەسیحەت وشیعرە شڕەکانتم
هەس نە کەواو کـولـەی
میراتیم گەرەکە!."

وەک چراتۆڕ دائەگرسم و
ئەیژم :

" ئیسە ئیتر شیعرەکانم
شڕن ؟ ئەی چۆن ئەووەختە
وەک دوعا **ئەوژنتە** ئاواو
ڕۆژی سێ دەفعە ئـەونیـا
سەرەوەو هەلت ئەقوڕانـد ؟
ئەو وەختە خاس بـوون ؟
ئەووت : شیعر عیشـق و
دلداریەکانۆ ئەمخاتە بیر
باس " عشق وجوانی" شێخ
سەعدی" وەلێ ئیستە مـن
لە قەناعەتەو قسـەو بـۆ
ئەکەم تۆ ئەیژی نەداری و
دەروێشی .گیانۆ دەرچوایێ
ژنۆ نەهاوردایێ ! نازانم
هەرگ کوێ بکەمە ســەردا
بەدەس تووەو......"

کاشکای دەور هەرعەتار
و پارچەفرۆش وبەنا بوایێ
خوب .بەناحەقیە سحف تـا
ئێوارە هاوار ئەکا:

بابێ نیمە
بابێ پارە
دادەی چارەک
ئایەی ..... بابێ
ئاجور.

عەسلەن خۆی وەزنـی
هەس .فۆرمی هەس،ئاهەنگی
هەس . شیعر نەوە! وەلـێ
داخ داخانم **وشتر چـەیـە**
**بە عەلاقەبەنیەو.** بێـژە
" ئاموحیب " تۆ ئیتـر
بۆچە برا؟ ئاخر مال کاول
تۆ چت تیا دوزیگـەسـەو
وا خوەتی بۆ ئەکوژی ؟
مەوچ و جانمازیش هەسیان
بەسەر شیعرەو بە گیان

عەزیزت بەمەرگ منالم لەم
شارا بۆ دوکتۆر ئەڕۆی ناو
نوسخەکەتا تەخمین ئەکـەن
لەسەر غەزەل بووعەلی سینا
و عەتار! وەختێکیـــچ
ئەیژی مامە! بەسە!عەیبە!
ئۆف ئەکەن وئەیژن "حاشـا
لەم ولایەتە گەوهەرشناسی
تیا نیە! حەیف! ســەد
حەیف دائەنیشم شەو وەخت
خوەم ئەگرم. تێمە ناو
بالکۆن . چش ئەکەم لـە
خەوومال وشۆفاژ و قورسی
خەو ئەنمە جێگەی،ئێوەی
بەوبەخت شیعرتان بۆئەنووسم
ڕۆشنتان ئەکەمەوە وەلـێ
ئێوە قەدرم نـازانـن
شیعرەکانم حەرامتان بێ !

دریژەی هەیە

تێبینی: لەپڕکردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (ˇ) دانەنراوە واتا ئەگەر بۆوێنە وشەی ( شڕ، کوڵ، زۆڕ، شەڕ و. ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، کول، زور، شەر و. ) دەنووسرێ

١ـ شاعیرێکی بەناوبانگی کورد کە پێش "گۆران" شیعری پەنجەی گوتووە و "شەو" یەکێک لەشیعرەکانی ئەوە ٢ـ دەنگی فرۆکە ـ خوشکی گەورە ـ حەرفی ئیزافەی کوردی ٣ـ بشێوێ وتەفرەقە ٤ـ حەسانەوە ـ بۆ بانگکردن دەبێ بەڵام کەمکەس دەیڵێ ـ وردە وردە ڕاوەکەی وەختی هاتووە ٥ ـ درۆی ترکانە ـ پشیلەی شاری سنە ـ ناسۆڕوگریمانە ٦ـ تووڕەیی ـ ...بەستوی تاوانبار ـ ڕەشەکەی ماڵ وێرانکەرە وسوورەکەی پیاوکوژ ـ ئی دودانە بەتامترە ٧ـ چەرچی بۆ دێهاتی دەبرد ٨ـ گوڵی شاعیرانە و بە قەولی شاعیر لەسەر "یەک قەدەمو دێدە چەقیوە" ـ خۆراکی چەوری ئاژەڵ لەزستاندا یاری چاو ٩ـ یاری یەکی کوردەواری یە و بە دوو دار دەکرێ ـ کردنی سوننەت وجوابی فەرزە ١٠ـ وەتاغی مەڕ ـ لەو لاوەداوە وریابە تێی نەکەوی ـ هەگەر و بنۆس ١١ـ زانای پایەبەرزی کورد کە لەقەبی مەلێک ولکەلامی وەرگرتبوو هونەرمەندێکی بەناوبانگی کورد وبەیت بێژێکی دەنگ خۆشە وخوێنەرانی سروە باشی دەناسن ١٢ـ تاوتێ ـ ناوێک بۆکوڕ ـ فێنک وماندووحەسێنەوەیە ١٣ـ حاکم ـ فڵانی ـ وەخت ودەم ١٤ـ بەرز و نادیار ـ جوملە ـ نەرێت ١٥ـ لە هەموو گۆنگەڵێک خۆ دەپارێزێ ـ دەستەی وەرزشی ـ بناخەی زمانی فارسی یە.

١ـ ناوچەیەکی پڕپیت وبەرهەمە لە مەهاباد ویەک لە پێنج ناوچەی سەربەم شارستانەیە نووستوی بێ گرێ ٢ـ شەخس وپیر ـ ڕۆژی عەرەب ٣ـ گراوی لاسی ئەحمەدخان ـ زۆری جەنووب و هەوای شیماڵ ـ لەسەرەخۆ ا ٤ـ وەڵامی روو لە حەوا ـ هەموو شت هەیەتی ـ کانگەی گڵەسوور ٥ـ درشت نیە ـ شارێکی هەورامان ـ نازناوی شاعیری ڕووناکدڵی کورد ٦ـ بووکی جەنووب پێخوری کەم ئی برس پێ ناشکێ ـ چەمی گەورەی شاری سەقز ٧ـ گەڵاڵەیەکی ئامووزش وپەروەرشە بۆ قوتابی وبریتیە لە کاروزانست ـ گێژوکاس ٨ـ پسپۆر یێکی یونانی قەدیم ٩ـ دۆشەگی لێک دراو ـ بیروباوەڕێکی نیشتمانخواری جیهانی عەرەبە و ماوەیەکی زۆر لایەنگری بوو کە بەناوی خاوەنی ئەم بیروباوەرە کراوە ١٠ـ کایە ـ چەشنە داهاتێکی دەوڵەت ـ بەچەند دێ دەگوترێ ١١ـ خوو ـ بەرازی مێ ـ لە ئاش زۆر پێویستە ١٢ـ مردنی لەنەکاو ـ بەدەن ١٣ـ لە هەندەران بۆ پێوان بەکار دێ و ٩٢ سانتە ـ ئامێز ـ ژمارەیەکە ١٤ـ لق و پۆ ناوچەیەکی هەورامانی تەخت ـ چیایەکی بەرز لەکوردستانی تورکیا کە دەڵێن گەمیحەزرەتی نووح (د.خ) لەپاش تۆفان لەوێ گیرساوەتەوە ١٥ـ نازناوی شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە بە ناوی مەلا ساڵح کە لە خانەقای بورهان بووە ویەکێک لەشیعرە بەرزەکانی ئاوا دەست پێدەکا: "لە خەرمانی ئەمەل مێرووی عەمەل جەزبی نەکرد دانێ" ـ نازناوی جەمیل سیدقی زانای پایەبەرزی کورد

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ع | ە | ب | د | ا | ل | ح | ا | ق | ل | ب | د | ل | ک | ی |
| ٢ | و | ا | ل | ی | ■ | ■ | و | ■ | ک | ■ | ر | ە | ر | ە | ر |
| ٣ | ر | ج | ا | ■ | ز | ر | ی | و | ە | ■ | ە | و | و | ش | ە |
| ٤ | خ | ە | و | ز | ی | ە | ■ | ■ | ت | و | و | ■ | ش | ا | ک |
| ٥ | و | ر | ■ | ە | و | م | ی | ر | ■ | ا | ■ | م | ە | ر | ج |
| ٦ | ■ | ە | ■ | ب | ە | ل | ە | گ | ■ | ز | و | ر | ■ | گ | ە |
| ٧ | ب | خ | و | د | ر | ■ | ە | ە | ش | ■ | ز | ی | ن | ە | ب |
| ٨ | ژ | ا | ل | و | ■ | ش | و | ■ | ن | م | ە | ب | ■ | م | ی |
| ٩ | ■ | ت | ا | ر | د | گ | و | ر | ر | و | ن | ■ | ک | ا | ن |
| ١٠ | گ | و | ت | ■ | ن | ا | د | ە | ■ | و | ■ | ک | ە | ل | ■ |
| ١١ | ش | و | ی | ن | ■ | ر | ■ | پ | ە | س | ت | و | و | ■ | م |
| ١٢ | ■ | ش | م | ە | گ | ی | ر | ■ | د | ا | ل | ■ | ■ | ش | ە |
| ١٣ | و | ■ | ل | ز | ا | ■ | ی | ە | م | ■ | ت | و | م | ە | ت |
| ١٤ | ش | ل | ■ | ر | ە | ن | س | و | ل | ف | ە | ز | ە | ن | ی |
| ١٥ | گ | ە | ر | گ | ر | و | گ | ■ | ■ | ق | ■ | د | ر | ە | و |

لەنێو ئەو کەسانەدا کەپڕکراوەی ئەم ژمارەی سروەمان بۆبنێرن، یەک کەس بەپێی پشک بەبەرەندە دەناسرێ. بەمەرجێک ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگرێ:

١ـ جەدوەلەکە بەخەتێکی خۆش بنووسرێ وا بێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە.

٢ـ ئەسڵی جەدوەلەکەمان بۆبنێرێ لەکاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ.

٣ـ لانی زۆر پازدە ڕۆژ پاش دەرچوونی گۆڤار پڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ.

٤ـ پڕکراوەی جەدوەلگە هەڵەی تێدا نەبێ جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل سالێک ئابوونمانی گۆڤاری سروەیە.

شیرنە و ترش دەبێ
ترشە و شیرن دەبێ

---

چنارێکم هەر لە چنارێکی
سەربانێکم هەیە لەسەربانێکی
قولەگۆچانێکم هەیە بەبزمارێکی

---

گای سوور
گای رەش دەردەکا

---

سەری سوورە عەلامەت
بنی قوولە قیامەت

---

کڵاوی پاڵەوانی
بەهەموو ماڵان دەزانی

---

وشتر بەبارە نەفتەوە
هەرهەڵدەستا ودەکەوتەوە

---

# پەندی پێشینیان

ئوسا بدە بەردا ساخو
بلا ملێ تە نەئێشە.
حەتا دەقێ تە دقەڕمە
بلا لنگێ تە بقەڕمە.
گور چ زانە هێستر بهایە.
ئانگۆری تاسکێ چۆچکی لێدە.
هێک دز دبە هێشتر دز.
حەتا مرۆڤ بچووکا تییێ
نەکە، مرۆڤ مەزنا تییێ نابینە.
مرۆڤ ب پی یان بشمتە
دکارە
خو بگرە ئەمما ب ئەزمان
بشمتە نکارە خو بگرە.
ئەگەر تو بەرانێ بسکۆ بای
تویێ لناڤ پەزێ باقۆبای.
ئەو مری هێژایی وێ شینێ
نینە.
ئەز هادکم دێ دمرە
ئەز هۆدکم باڤ دمرە.
ئەڤراز دنێرم سمبێلە
بەرژێر دنێرم ردینە.
بن مرا گلی وئاڤە، سەر
مرا رازا بی باڤە.
مرن مێڤانەکە کو دەرییێ
حەموویێ دکوتە.
سەری کو حاکم ببرە
خوون ژێ نایێ.
ئەگەر ئوم پێنجن وەیان
شەشن، ئەم خولامێ دیزکارە-
شن.
بلا خودێ یار بە
بلا شوورێ مرۆڤ دار بە.

دەعبای گۆشتخۆر دندووکی
خوارە.
ئەگەر زمان لێ بگەڕێ
سەر بە رەحەتە.
گوریس بۆ مارانگاز مارە
ئاور تەڕوویشکی ناناسێ.
یا خودا دەبێ یا خورما
مەڕ بەپێی خۆی بزن بە
پێی خۆی.
مردوو بەگرین ناژێتەوە.
ماڵ بەهاوار نابینیەوە
سۆ وەسۆ دەچێ.
گلۆڵە وە پۆ دەچێ
تەمبەڵی بەغدایە
قایل بە کایە
کاشیان نەدایە
سوار سوارە وپیادە پیادە
ئاش بە نۆرەیە
قەل وقەل، کۆترو کۆتر.
ماڵی خۆت توند بگرە
کەس بە دز مەگرە
خواردن ئاگای لە بڕان
نیە.
چۆمیش ئەگەر بەری نەگری
وشک دەبێ.
مەڕ بەرخی خۆی ناشێلێ.
گیا ئەوەیە بە دمی بزن
خۆش بێ.

رۆژێک قوتابی لە ماموستای دەپرسی قوربان بە فارسی بەگێوژ دەڵێن چی ؟

ماموستا کە بۆ وەرام دادەمێنێ دەڵێ دانیشە رۆڵە ئێستا کواوەرزی گێوژە ئێستا وەرزی تەماتەیە و بەتەماتەش دەڵێن «گوجە فرنگی»!

رۆژێک ماموستا قوتابی بانگ دەکا ودەڵی بنووسە " تەیر" (طیر)

قوتابی نازانی بینووسێ . ماموستا لێی دەدا و دەری دەکا . قوتابی بەگریانەوە دەچێتەوە ماڵ . دایکی لێی دەپرسێ بۆ دەگری ؟

دەڵێ "ماموستا کوتی بنووسە "تەیر" نەمزانی و لێی دام."

دایک کوتی :

" لەمنت نەکەوێ ئەگەر تەیرت نەدەزانی نووسیبات " تەیرەن ئەبابیل !"

کابرایەک سواری وشتر دەبێ وقاوت دەخواو بایەکی توندیشی دێ. رێبوارێک بەتەنیشتی دا تێدەپەڕێ و لێی دەپرسێ :

" قوربان ئەوە چ دەخۆی ؟"

وشترسوار جواب دەداتەوە:

" هەتا ئەو بایە لەو کونەوەبێ هیچ !"

«بروس لی» پالەوانی کاراتەی دنیایە و زۆر بەناوبانگە .رۆژێک فەرهادم چاوپێکەوت شەڵواری " لی" دەبەر کردووە وبرۆسێکی لەبەر کەمەری چەقاندووە ! لێم پرسی:" فەرهاد ئەو برۆسە چیە لەبەر کەمەرت چەقاندووە؟"

کوتی :

" دەمەوێ ببمە بروس لی !"

•••

پیرێژنێک لە گوندێک دەژیا وچەند هەتیوی بەخێو دەکرد. تەنیا مانگایەکیان بوو کە شیرەکەیان دەخوارد

رۆژێک مانگا مندار بۆوە. پیرێژن کەوڵی کردو کەوڵەکەی دابە سۆفی یەکی لەخودا ترس لە بازار، بۆی بفرۆشی .

سۆفی کەوڵی دابە چل قران پووڵی سپی و بەرەو گوند گەڕایەوە. لە رێگا پووڵەکەی لێ هەڵڕژا! ناو خۆڵەپۆتینەیەک . پووڵی کۆکردەوە وبژاردی ٣٩ قران بوو دووبارە گەڕا هیچی نەدیتەوە وپووڵەکەی دیسان بژاردەوە ٣٨ قران بوو . بەتووڕەیی پووڵی دەکیسە کردەوەو کوتی :

" هەرسێک تەلاقم کەوێ ماڵی هەتیو نەبای ئەوەندەم دەبژاردی قرانێکت نەمابا !"

# فەرهەنگۆک

**تی بوون :**
تیهنی بوون ،تینووبوون .

**پشک :**
بەش . پار

**گۆتە :**
وشە . پەیڤ .

**برەک :**
برێک ، دەستەیەک .

**گەلۆ :**
ئایا

**ئوورسێت :**
ئوورسات .یەکێتی سوڤێت .

**وەرزگاری :**
وەرزێری . جۆتیاری .

**تەرشداری :**
دامداری . خودان کرنا مەر و مالاتان .

**ڤێرە :**
ئێرە . ڤێ دەرێ .

**هەیلۆ :**
حەتا . تا .

**قورتساندن :**
قوتکرن . قرتاندن .

**چق :**
لک . شاخە .

**ڤەژاندن :**
پشکنین .

**شرۆڤەکرن :**
شێ کردنەوە .

**ئاخین :**
نالین

**هێنژین :**
خەونووچکە بردنەوە .

**لەیلان :**
سەراب . تراویلکە .

**بەدەو :**
جوان .جندی . خۆشـــک
خۆشکۆک .

**سەقەم :**
سڕ سایەقە .

**ور :**
وێدەرێ . ل وێ . لەوێ .

**حەیس و بەیس :**
کەین و بەین .

**بە تاشای دڵ :**
بە ئارەزووی دڵ .

**کەسێکم لەدەست زایە بووە :**
کەسیکم کوشتووە .

**بەروانکە :**
بەرپێسیر ، کوتەپارچەیەک کە لەبن چەندی منداڵ را تاکۆشی دادەپوشی .

**وارش :**
دیوارە بەردی دەوری چاک و باغ و کانی .

**ئامێتە :**
تێکەڵاو .ئاوێتە (آمیختە ) .

**خێو :**
ساحێب .خودان . خاوەن .

**سواڵەت :**
لەتکە گۆزە .گڵێنە (سفال ) .

**هەمانگێ :**
بەزەحمەت .هەر ئەوەندە بەزۆری .

**مینا :**
**هێورزە :** بینا . وەک .
هەرا و بگر . **بحەسە :**
**ئوندا :** ئاگادار بە.
ون . بزر . وندا

**قەرەبووکردنەوە :**
تێ هەڵێنانەوە .تۆڵەکردنەوە

**جوربزە :**
غیرەت ،شەهامەت ،کارامەیی

**ملۆزم:**
دژکار . (مزاحم )

**مەیسەربوون :**
جێ بە جێ بوون .مەیسەرکردن جێ بەجێ کردن .

**کولەدار :**
ئیستعمارگەر .

**تۆرە :**
تۆرەمە . رەگەز .

**هەڵس وکەوت :**
هەوراز و نشێو .

**دڵمەند :**
دڵگیر .ناراضی .بەگلەیی .

**دڵبەند :**
عەلاقەمەند ، لایەنگر .

**هەڵپە :**
پەلە .توندی . (شدت )

**خۆ مەڵاس کردن :**
خۆ مات کردن .کەمین کردن.

**تاوێر :**
جاڵە . بەردی زل ،گاشە

**خلار (خلۆر )کردنەوە :**
بەردانەوە لە هەورازی بۆ نشیو .

**پێگان :**
ئەنکاوتن . لێدان بە گوللە و تیر .

**هاژان ، هەژان :**
بەتوندی نەفەس کێشان جووڵانەوە .

**گەردەلوول :**
بای توند کە تۆزوخۆڵ بەرەو ئاسمان لوول دەکا .

**تووتنەکەی خۆش بوو :** سادە بوو . بە ئاسانی فێڵی لێ دەکرا .

تەنگی سەر :دیاری ئیقبال ئیبراهیمی ـ سنە

ئەنگوور :دیاری خالیدئیسماعیلی ـ مەهاباد

تاڤگە: دیاری خالیدقەلعەکووهی ـ بۆکان

گوڵ : جەلال واهیم ـ شنۆ

خورینج: عوسمان رەسووڵی ـ خانێ